چاپی چوارەم

زنجیرەی ژیانەوەی کەسایەتی ئافرەتی بڕوادار ( 1 )

# کۆسپەکانی حیجاب

## (باڵاپۆشی)



ئامادەکردنی
حسام الدین جودت
پێش نوێژی مزگەوتی شافعی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
غازی اسماعیل میرۆستەمی

٠٧٥٠ ٤٤٨٩٤٢٩ _ ٠٧٥٠ ٤٥٣١٩٢٩

زنجیرەی ژیانەوەی کەسایەتی ئافرەتی بڕوادار (١)

# کۆسپەکانی حیجاب

## «بـــالاّ پۆشـــی»


ئامـــادەکردنی

حسام الدین جودت

پێش نوێژی مزگەوتی شافعی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

غازی اسماعیل میرۆستەمی



چاپی چوارەم

هەولێر - ٢٠١٢

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيم

ناوی کتێب: کۆسپەکانی حیجاب
ئامادەکردنی: حسام الدین جودت
وەرگێڕانی: غازی اسماعیل میرۆستەمی
تایپ و دیزاین: سرود مستەفا کریم
سەرپەرشتی چاپ: نەهرۆ مەحمود
نۆرەی چاپ: چاپی چوارەم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( ٣٢٤ ) ساڵی ( ١٩٩٩ ) دراوەتێ

لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی
(رەسەن و غازی)
هەولێر

# بسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ (٢٦)(الأعراف)، واته: ئەی نەوەی ئادەم بەراستی ئیمە پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون، عەورەت و ئەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دای ئەپۆشێت، هەروەها جل وبەرگی جوانیش کە خۆتانی پێ برازێننەوە (بەلاَم بیرت نەچێت) کە پۆشاکی تەقواو خواناسی چاکترو بەفەڕترە، ئەو پۆشاکە (ماددی و مەعنەویانە) لە نیشانەو بەلَگەکانی خودای گەورەن بۆ ئەوەی یادەوەری وەربگرن و (یادی بەهەشتبکەن) **تەفسیری ئاسان لاپەڕە (١٥٣)**.

يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ (٢٧) ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً (٢٨) فَادْخُلِي فِي عِبَادِي (٢٩) وَادْخُلِي جَنَّتِي (٣٠ الفجر) (٢٧)شایەنی باسە بە ئیمانداری سەرفراز لەسەرە مەرگدا دەوترێت ئەی خاوەنی دلّ و دەروونی پڕ لە ئارامی (ئەی ئادەمیزادی ژیرو هۆشمەند کەلە تەمەنی کۆتایی دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانی دەتپەرست..) (٢٨) بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو رازیت و ئەویش لەتۆ رازیە. (٢٩) دەبچۆرە ریزی بەندە چاکە نازدارو بەرێزەکانەوە. (٣٠) بچۆرە بەهەشتە خۆشە رازاوەکەمەوە. **تەفسیری ئاسان لاپەڕە (٥٩٤)**.

# پێشەکی چاپی چوارەم

## تەنها بەناوی خوای میهرەبان

بۆ چاپی چوارەمی . ئەم نامیلکەیە , لە بەرنامەدانەبوو هیچ پێشەکیەك بنووسین , بەلاَم قەدەری خوا وابوو لەدوا ساتەکانی بەرلەچاپ گەیاندنی , کورتە نامەیەکم بۆ هات لەلایەن برایەکەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی : خوشکێکی موسلْمانی بالاَپۆش خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا , لە یەکێك لە زانکۆکانی لندن وتارێك یان لێکۆلینەوەیەك پێشکەش دەکات , کەتوانی سەرنجی ئامادەبوان ڕاکێشێت , دوای تەواوبوونی کۆڕەکە ڕۆژنامەنووسێك لێ ی نزیك دەبێتەوە و پێ ی دەلْێت : بەراستی ئەو زانیاریانەی پێشکەشت کردن لەگەلْ چۆنیەتی جل و بەرگەکەت ناوەشێتەوە ! ئافرەتەکەش پێ ی دەلْێت : باشە تۆ زانیاریت هەیە کە لە سەرەتای بوونی مرۆڤ لەسەر زەویدا ڕووت بووە و بەرە بەرە لەگەلْ پێشکەوتن و پەرەسەندنی هزرو فیکری زیاتر خۆی داپۆشیوە و جل و بەرگی باشترو پۆشتەتری دەبەرکردووە ؟ ئەویش دەلْێ بەلْی وایە .

ئافرەتە موسلْمانەکەش پێ ی دەلْێ : دەباش بزانە ئێستا من گەیشتومەتە ئەوپەڕی پێشکەوتنی هزرو هۆشمەندی لەبەکار هێنانی جل و بەرگ بۆ داپۆشینی جەستەم .

**وەرگێر**

# بسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمد وعلى اله وصحبه أجمعين.

## پێشەکی چاپی یەکەم:-

لەبەر گرنگی رۆڵی ئافرەت لە خێزان و کۆمەڵگادا، وامان بە چاك زانی کە ئەم ئامیلکەیە، بخەینە بەردەستی خوشکانمان بەتایبەتی، لەکاتێك دوژمنان و ناحەزانی ئیسلام، بەهەموو شێوەیەك هەوڵدەدەن و شاڵاوی ژەهراوی دەکەنە سەر رەوشت و پەیوەست بوونمان بە فرمایشتەکانی خودا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دەیانەوێ شیرازەی خێزانمان لێ هەڵوەشێننەوە و بەرەو هەڵدێر، راگوێزمان بکەن.

جا خۆشکی بەرێزم ...... خوشکی مسوڵمانم:

- ئایا تۆ ... بەختەوەریت دەوێت؟
- ئایا ئارامی و هێمنیت ئاواتە؟
- ئایا دەتەوێت بەوپەڕی رێزو رەوشت بەرزیی یەوە بژیت ؟
- ئایا دەتەوێت دووربیت لە پەلاماری ئەوانەی، دوورن لە هەموو پێوەرێکی رەوشت و مرۆڤایەتی؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەو هەموو پرسیارانە، ئەوا خودای گەورە بانگهێشتت دەکات بۆ گەیشتن بە سەرجەم ئەو شتانەی

کە هیواو خۆزگەیان بۆ دەخوازێت.

هەروەك خودای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێت: (وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا) (الأحزاب: ٧١) بەراستی ئەوانەی ملکەچی فرمایشتەکانی خوداو پێغەمبەری خودان، گەورەترین سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، ئەگینا بە پێچەوانە کارکردن، بێگومان یاخی بوونە لە خوداو پێغەمبەری خودا (صلی الله علیه وسلم) بەواتایەکی تر، نەگبەتی و ماڵ وێرانیەکی بێ وێنەی لێ دەکەوێتەوە کە دەفەرموێت (جل جلاله): (وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا) (الأحزاب: ٣٦)

ئەوەی یاخی بێت لە ئەنجامدانی فرمایشتەکانی خودا و پێغەمبەری خودا بەراستی تەواو گومڕا بوەوگومراییەکی ڕونوئاشکرا.

بۆیە خوشکی بەڕێزم، زۆر بە راشکاوی و راستەوخۆ پیەوە، خوای گەورە بانگت دەکات، بۆ پەیوەست بوونت بە فرمانەکانی.

تەنها و تەنهاش، هەر لە ژێر سێبەری جێ بەجێ کردنی فرمانەکانی خودا، ڕێزو پایەی راست و دروستی خۆت دەدۆزیتەوە، وە یەکێ لەو فرمانە گرنگانەی خودا، بۆ ئافرەتان، خۆ داپۆشینە. کە زۆربەی ئافرەتان لێی بێ ئاگان و پەیڕەوی ناکەن! بەچەند پاساوێکی خەیاڵی و دوور لە شەرع. بۆیە با بەیەکەوە هەوڵ بدەین بە پشتیوانی خوا، وەڵامی ئەو پاساوانە

بدەینـەوە، بـەو هیوایـەی خـودای گـەورە پالْپـشتمان بێـت، بـۆ گەیانـدنی بـە دڵـەکان. بـێ گومـان، ئـەمڕۆ کتێـب و نامیلکـەو بابـەتێکی زۆر بـۆ ئافرەتـان و، لەسـەر ئافرەتـان بـە گـشتی دەنوسرێت و بلاو دەبێتەوە، هەروەها زۆریش بەتایبەتی لەسـەر ئافرەتانی بڕواداری بالاپۆش دەنوسرێت .

ئـەوەی ئاشـکرایە، پەیوەسـت بـوونی ئـافرەت بـە پۆشـینی پۆشـاکی ئیـسلامی، ڕێـزو ڕەوشـت و پایـەی ئـافرەت بەرزدەکاتەوە، ئەم ڕاستیەش زۆربەی ئافرتـان لێـی دڵنیـان، وە دانـی پـێ دادەنـێن، بـەلام بـە بیـانوی هەنـدێك هۆکـارو پاسـاو هێنانـەوە، خۆیـانی لێ بـە دوور دەگـرن، هەرچـەندە لـە دڵ و دەروونیاندا دان بـەوە دادەنـێن کـە، بـە هەڵـە داچوون، چونکە ئەگەر بێت و ئەم باسە لەگەل هـەر خوشـکێکدا بکرێتـەوە، هـەر لەسەرەتاوە، کەم تەرخەمی و شەرمەزاری خـۆی رادەگەیـەنێت. ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیـە، ئـەو هۆکـارو پاسـاوانە شیبکەینەوەو، بە بەڵگەی شەرعی و عەقلی و زانستی

پـشت ئەسـتوور و دەوڵەمەنـدیان بکـەین، چـونکە بەشـێکی زۆری ئافرەتانی ولاتانی ئێمە گومڕابوونە بە بیروبۆچوون و جل و بەرگ و هەڵس و کەوتی ئـافرەتی ولاتـی ڕۆژئـاواوە وئـەوانیان کردوەبە پێشەنگی خۆیان ! ؟

## ((کەی و چۆن پیلانی داماڵینی باڵاپۆشی لە جیهانی ئیسلامی سەری هەڵدا))؟

دوای رووخـانی دوا قـەڵای ئیـسلام، مەبەسـتمان (دەوڵـەتی عوسمـانی)یـە، پـێش رووخـانی، تووشـی نەخۆشـی و ڤایرۆسـی رۆژئاوا بوو، نیشانەکانی ئەو نەخۆشیەش لـەناو کۆمـەڵگا بـەدی دەکراو پێی گرفتار بوو، وە ببوو بە بووکە شوشـەیەکی دەسـتی داگیرکـەران، بـە ئـارەزووی خۆیـان هەڵبـەزوو دابـەزینیان پـێ دەکرد. هـەروەکو ئاشکراشـە هـیچ کاتێك داگیرکـار و ناحـەزانی ئیـسلام حـەزیان بـە بەرجەسـتەکردنی شـەریعەتی ئیـسلام نەکردووە و ناکات، جا چ لە لایەن تاکە کەسێکەوە بێت، یان لـە لایـەن کۆمـەڵ و دەوڵەتـەوە بێـت. بۆیـە گـشت هۆکارەکـانی وەگەرخستووە بۆ بەربەرەکانی کردنی ئەم شەریعەتە.

وە ئەوەی زانیومانە، هیچ حوکمێك لـە حوکمـەکانی ئیـسلام، تیری تێ نەهاوێژراوە و پیلانی بۆ دانەرێژراوە، بەقـەدەر ئـەوەی کە دەرهەق بە شەریعەتەکەی کراوە بەتایبەتی لەو بوارانـەی کـە تایبـەتن بـە سیـستەمی خێزانـی موسـڵمان و، تـا چ رادەیـەك کەوتۆتـە بـەر هێـرش و هـەوڵی هەڵوەشـانەوەی شـیرازەی ئـەو خێزانە! بەتایبەتیش، باڵاپۆشی ژنی مسوڵمان، ئەو باڵاپۆشیەی کەسایەتی دەپارێزێـت و بـەرگری لـە ناموسی دەکـات. ئـەوەی راستی بێت، هۆکاری سەرەکی ئەو هێرشـە دژوارە ئەوەیـە، ئـەو

دوژمنانــە پەیوەندیــەکی بــەتینیان بــەدی کــردووە لــە نێــوان باڵاپۆشــی و پــارێزراوی کەســایەتی و نــاموس. جــا لێــرەدا بەرجەســتەکردنی شــەریعەتی خــوداو، هەوڵــدان بــۆ وەدەســت هێنانی هێز، هەر وەکو خودای باڵادەست فەرمانی پێ کردووین، میللــەت (الامــة) دەپارێزێــت لــە پیلانــی دوژمنــانی. وە خێزانــی مسوڵمانیش، بەردی بناغەی دروست بوونی کۆمەڵگای ئیسلامی یــەو، باڵاپۆشــیش، بەشــێکە لــەو بــەردە کــە دەیپارێزێــت لــە مەبەستە گڵاوەکان و دزانــی عــەرزو نــاموس، هــەروەك چــۆن لــە هەمان کاتــدا کەسایەتیەکەشــی دەپارێزێــت لــە توانــەوەی لــەنێو کۆمەڵگای تردا. بۆیە بێگانــە زۆر پــەرۆش بــووە لــە گەیشتن بــە ئافرەت و ژنی موسوڵمان، بۆ ئەوەی بگات بەو مەرامانەی کــاری بۆ کردووە و هیوای بۆ خواستووە لە ناو کۆمەڵگای مسوڵماناندا، تا وای لێ هات (خەلافە) تیان رووخانــدو جەستەکەشیان پارچــە پارچە کرد بۆ چەند پارچەیەکی:

- جیاواز لە بیرو بۆچوون ...
- جیاواز لە چۆنیەتی فەرمانرەوایی ...
- نــارێکی و نــاکۆکی لــە نێوانیانــدا لــە زۆربــەی کاتەکانــدا، بــۆ راستی و سەلماندنی گوتەکانمان، هەر یەکێك لە ئێمــە ئەگــەر ســەیری نەخــشەی جیهــانی ئیــسلامی بکــات، نالەباریــەکی زۆرمان بۆ دەردەکەوێت لە نێوان ئەو دەوڵەتانــەدا، نــاکۆکی لەســەر ســنوور و شــتی تــری دروســتکراو ... وە دیــارترین بەڵگەش لەسەر ناکۆکی و پەرتەوازەیی و نەبوونی یــەکریزی،

له كۆنگرەكانی سەرانی دەوڵەتەكانی جیهانی ئیسلامی بەدی
دەكرێت. چونكە بێگانە سەركەوتوو بوو لە دانانی پیاوانی
خۆی لە پۆستی بەڕێوەبردنی وڵاتان، بەناوی ئازادی و
دیموكراتی بەرژەوەندی میللەت. وە هەربەناوی ئازادی،
ژنانیان فریوداوە، بەرەو لاسایی كردنەوەی ژنانی
خوانەناس، بەو بیانوەی كە: (تاوەكو ئافرەت باڵاپۆشەكەی
فڕێ نەدات، ناتوانێت بەرەو پێشكەوتن و بنیاتنانی
شارستانیەت هەنگاو بهاوێت)! ؟ ئەو ئافرەتەش، بە هیوای
وەدەست هێنانی پلەیەكی بەرزتری ژیانی و گەیشتن بە
كاروانی ئافرەتی بیانی، ئاڵای سپی هەڵكردو (حیجاب)ەكەی
فڕێ دا. ئاخر خوشكی من .. تۆ مسوڵمانیت و خاوەن بیرو
باوەڕێكی خاوێن و بێگەردیت، ئاینی تۆ ئیسلامە، ئاینی
ئەوان لەوانەیە لە جولەكەو نەسرانیش دوور بێت! چیت داوە
لەوان؟ تۆ وابكە ئەوان بەرگەكەی تۆ بپۆشن، بەرگەكەی تۆ
زیاتر ڕێزو شكۆداری بەزن دەدات . دوژمنانی باڵاپۆش،
جۆرەها پلان و نەخشەیان دارشتوە بۆ لە خشتەبردن و
سەرلێشێواندنی ئافرەتانی مسوڵمان، بۆ ئەوەی دایماڵن لە
بەرگە پیرۆزەكەی، جا هەرجارەو بە ناوێك:-

١- وایان تێگەیاندووە كە شارستانیەت دروست نابێت، مەگەر
بە فڕێدانی باڵاپۆش نەبێت!.

٢- لێ شاردنەوەی گرفتاری و دەردەسەریەكانی ئافرەتانی
ڕۆژئاوا،كە تا چ ڕادەیەك باجی ئەو خۆ ڕووت كردنەوەیان

داوەو چی بەسەر بانگخوازانی ئەو ئازادیەی ئەوانی هێناوە؟

٣- وایـان تێگەیانـدوە کـە ئاینەکـەی مایـەی دواکەوتنیـەتی و، ئەگـەر خـۆی لـە ئاینەکـەی جیـا نەکاتـەوە، هـەروەك چـۆن (ئـاژەڵی سـەربڕاو کـەور دەکرێـت)، هەمیـشە بەنـەزانی دەمێنێتـەوە. ئـەمیش وەك گوێڕایـەڵێك وازی لـە ئاینەکـەی هێنا، کە پیرۆزترین و بەهادارترین پلـەی کەسایەتیەتی، لـە ئەنجامدا بێ ئـایین و بـێ بـاڵاپۆش مایـەوە (ئەمیـشم چـوو، ئەویشم چوو).

٤- بەکارهێنان و وەگەڕخستنی ئافرەتی موسوڵمان، بۆ مەرامـە پیسەکان.

٥- بـە فێرکردنـی زانـستە کۆمەڵایـەتی یـەکان و هونەریـەکان و نەریتی ڕۆژئاوایی، جا چ لەناو وڵاتانی خۆیـان بێـت، یـان لـە هەنـدەران، لـە کاتێکـدا ئـافرەتی موسـوڵمان پێویـستی بـە زانستە تەکنەلۆژیەکان هەیە، کـە ڕۆژئـاوا بـۆ خـۆی قـۆرخی کردووە.

٦- فریودانی بە زرق و برقی جل و بەرگ، کـە گوایـە ئـەو جـل و بەرگانـە شەخـسیەت بـەئافرەت دەدەن ! لێـرەدا مامۆسـتا (عبدالصبور شـاهین) کـە پێـشەکی بـۆ پـەرتووکی (الاسـلام یتحـدی)ی نوسـیوە، کـە دانەرەکـەی (وحیدالـدین خـان)ە دەڵێ: (ئێمە ناتوانین بە ئاسانی لـە شـەپۆڵەکانی زاڵ بـوون بەسەر کۆمەڵگاکانمان تێ بگەن، مەگـەر بـە تێبینـی کردنـی ئەوە نەبێت، کـە تـا چ ڕادەیـەك! ئافرەتـانی موسـوڵمان لـە

زۆربەی ولآتانی رۆژهەلآتدا شوێن کەوتووی هەموو ئەو شتانەن کەلە ئەوروپا و ئەمریکادا سەر هەڵدەدەن لە جل و بەرگ. ئەگەر یەکێك لە (مانکان)، یەك سانتیمەتر لە سەرەوەی ئەژنۆ لەبەر بکات، ئەوا کچانمان دەست پێشخەری دەکەن لە کورتکردنەوەی بە ئەندازەی یەك بست و گرینگتریش لەمە: ئەوەیە کە گەورە بەڕێوەبەرانی ئەو کارگانە، بواریان بۆ رەخساوە کە زاڵ بن بەسەر کچە رۆشنبیرەکان. لە کاتێکدا خاوەن ئەو کۆمپانیایانەش زۆربەیان ماسۆنین. هەروەك بڵێیت ئەمانە (ئافرەتەکان) هەر هەموویان ئەندامی یەك تیپی مۆسیقان و (مایسترۆ) لەبەر دەمیان وەستاوە و بە ئاماژەکردنێکی پەنجەی، یان گۆچانەکەی، هەر هەموو ئەندامەکانی (مۆسیقا ژەنەکان) دەکەونە جووڵە، بەگوێرەی ئاراستەی جووڵەی بەنجەکەی، هەر وەك مەڕ[1].

٧- هەڵفریودانی ئافرەتی موسوڵمان، بە قەڵەمەکانی ئەو کەسانەی کە ناردراونە ولآتی رۆژئاوا، ئەوانەی کە پێش هەموو کەسێك فریودرابوون، لەوانەش کە ناویان دێنین، زانای ئەزهەری (رفاعة طهطاوی)یە کە (٥) پێنج ساڵ لە پاریس ژیانی بەسەر برد (١٨٢٦-١٨٣١)، کە زۆر دڵگیرو سەرسوڕماو ببوو بە فەرەنساو، یەکەم کەس بوو کە

---

[1] الأسلام يتحدى (وجيدالدين خان)- تقديم عبدالصبور شاهين.

بانگـــەوازی بـــۆ ئـــازادکردن و ســـفوری ئـــافرەت کـــرد. دووەمیشیان، (خیرالدین التونسی)بوو، ئەویـشیان (٤) ساڵ لە پاریس مایەوە (١٨٥٢-١٨٥٦) ئەویشیان تۆی رۆژئـاوایی لەگەڵ خۆیدا هێنا و لەناو خاکی وڵاتانی ئیسلامی دا ناشتی.

## ((بانگەوازانی سفور لە میسر))

میسر، بە گرینگترین خاڵی کارتێکردن دادەنرێت لە جیهانی ئیسلامی و عەرەبیدا بە گشتی، بەوەی کە شوێنێکی گرنگی هەیە لە گواستنەوەی هزرو هەڵویستەکان بە ئاسانی و،رۆڵێکی کاریگەریشی هەیە بە درێژایی مێژووی ئیسلام، چونکە:

١- گەورەترین دەوڵەتی عەرەبیە لەڕووی دانیشتوانەوە.

٢- گەورەترین دەزگای ئایینی لەسەر خاکی میسڕ دایە،ئەویش (زانکۆی ئەزهەڕە) کە خاوەن مێژوویەکی دێرینەو رێژگەیەکە لە رێژگەکانی هزرو فیقهی ئیسلامی.

بۆیە رۆژئاوا، زوو لێی وەخۆ کەوتوو، گرنگیەکی زۆری پێدا، مەگەر گرنگیەکی لەو چەشنە بە تورکیا درابیت، کاتێك کە پایتەختی خەلافەتی ئیسلام بووە. گومانی تێدا نیە میسڕ شانۆیەك بوە بۆ چەندەها مەسەلەی ترسناك و، شوێنی سەرهەڵدانی هەڵویست و مەردایەتی بووە کە زۆر بە بەرچاوی رۆڵیان هەبووە لە جیهانی ئیسلامیدا. وە دۆسیەی سفور، کە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە، مەسەلەیەکە لەو مەسەلە ترسناکانەی کەلە میسڕ دەستی پێ کردووەو، شانۆیەك بووە بۆ بینینی ئەو دەورە کەبە گەورەترین مەترسی دادەنرێت لە مێژووی نوێماندا[1].

---

[1] حجاب المرأة المسلمة (٤٠٣) محمد فواد.

ئەوەی بیەوێت شارەزا بێت لە مێژووی بەناو (ئازادکردنی – ئافرەت) لە میسردا، بۆی دەردەکەوێت کە رەگی ئەو بزووتنەوەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (محمد علی پاشا)ی والی میسر، کاتێك چەند کەسێکی خوێندەواری رەوانەی فەرەنسا کرد بەو نیازەی کەلەوێ فێری زانست و تەکنولۆژیابن.

یەکێك لەوانە شێخ (رفاعة طهطاوی) بوو، کەلەمەوبەر باسمان لێوە کرد، ئەم (رفاعة)یە یەکەم کەس بوو کە مەسەلەی (ئازادکردنی ئافرەتی) وروژاندوە لە میسر لەسەدەی نۆزدەی زایینیدا، بەمەش داب و نەریتێکی بەد و نامۆی بەدیهێنا و تۆی ئەو جۆرە دەنگانەی لە کێڵگەی پەروەردەی ئیسلامیدا ناشت، ئەو کارەشی زیاتر لە کتێبەکەیدا بەناوی (تلخیص الابریز فی تلخیص بارین) رەنگی دایەوە، کەلە لاپەرە (٣٥) دا دەڵێ: (بالآپۆش فڕێدان و تێکەلأوی لە نێوان هەردوو رەگەزەکەدا، کارێك نیە ببێتە هۆی گەندەڵی) وەیان دەڵێ: هەڵپەرکێ لەسەر شێوازی رۆژئاوایی، لادان نیە لە ئاین و کارێکی بێ شەرعی نیە بەڵکو رێکی و جوان نیشاندانی جەستە و لەنجەو لاریەتی)یە٠ وە لە ساڵی (١٨٩٤) دا واتە (١٢) ساڵ دوای داگیرکردنی میسر لە لایەن ئینگلیزەکانەوە، یەکەم کتێب لە ولأتی میسر کەوتە بازار، کتێبێك بوو بەناوی (ئافرەت لە رۆژهەلأتدا)، کە (مرقص فهمی) دەری کرد، ئەو نووسەرەش کەسێکی خاچ پەرستی داخ لە دڵ بوو، کەلەو کتێبەیدا زۆر بە ئاشکراو، بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئافرەتی موسوڵماندا شتی وا کراوە هەموو هەوڵەکانیشی بۆ گەیشتن بەم (پێنج ئامانجانە) بوو:

١- لەناوبردنی بالآپۆشی ئیسلامی.

٢- ئاسایی کردنی تێکەڵ بوونی ئافرەت بە پیاوانی بێگانە.

٣- تەسك کردنەوەو ئابلۆقەدانی بواری تەلآق دان و پێویست کردنی تەلآق دان لەبەردەم قازیدا.

٤- قەدەغەکردنی فرەژنی.

٥- ئاسایی کردنی ژن و ژنخوازی لە نێوان موسوڵمانان و قیبتی یەکان. وەلە ساڵی (١٨٩٨) دا کتێبێکی تر لە بەناوی (ئازادکردنی ئافرەت- تحرير المرأة) لە لایەن (قاسم أمين) لە چاپدرا , لە دوای ئەویش کتێبێکی تر بەناوی (المرأة الجديدة) ئافرەتی نویێ، ئەم قاسم ئەمینە، کەسێکی کورد بوو، چوو بۆ پاریس بۆ ئەوەی خوێندنی لەوێ تەواو بکات! لەوێ دۆستایەتی لەگەڵ کچێکی فەرەنسی دروست کرد بەناوی (سلافا) کە هەمیشە هاوەلآیەتی دەکرد بۆ نێو کۆمەڵگاکانی فەرەنسی، فەرەنساش لەو کاتەدا، بزووتنەوەیەکی ئافرەتانی لێ وەگەڕکەوتبوو هەروەکو لە ئینگلتەراو ئەمریکاشدا هەبوو، هەموو ئەو بیرۆکانە قاسم پێیانەوە دڵگیر بوو، وە قاسم پاڵپشتێکی باشی لێ کرا لە لایەن (شێخ محمد عبده) و سەرکردەی ئەو کاتەی میسر (سعد زەغلول)، پارێزگاریشی لێ دەکردن لەو بیرو بۆچونانەی دەربارەی ئازادی و سەربەستی. هەرچۆنێك بێت قاسمیش وەك (طهطاوی) مەرامی ئەوە بوو کە ئافرەتەکانمان وەك ئافرەتی ئەوروپی پەروەردە بکەین و نەرمی بنوێنین و چاو بپۆشین لە تێکەڵ بوونیان لەگەڵ پیاوانی

بیگانەدا.

قاسم لە کتێبەکەیدا (المرأة الجديدة) دا دەڵێ: ئافرەت هەر دەبێت لەماوەیەکی نزیکدا بگات بەو ئاستەی کە ئەوپەڕی داواکاریەکانی تێدا رەنگ بداتەوە، لە یەکسان بوونی لەگەڵ پیاواندا، لەگشت مافەکانداو، هەریەك لەو دوو رەگەزە لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ بن . لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت قاسم هیوا دەخوازێ کە ئافرەتانی موسوڵمان لە شێوەی ئافرەتانی ئەوروپا ببینێت، کەچی ئافرەت ئازاد نەبوو! بەڵکو بەشێوەیەکی نالەبارتر کەوتە ناو داوی دەست بەسەری و جاهیلیەتێکی تازەتر. وەبە نەمانی ئەو کەسانەی وەك (طهطاوی و قاسم أمین)، ئافرەتان خۆیان ئەو ئاڵایەیان وەرگرت، ئافرەتانی دڵگیر بە ئەوروپا دەستیان کرد بە بانگخوازی بۆ سەربەستی و باڵاپۆش فڕێدان و، وازهێنان لە هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە ئیسلامەوە هەیە، وە (هدی شەعراوی)[1] یش، یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی کە بەشداری لە شۆڕشی (١٩١٩) دا کردبوو، بەسەرکردایەتی (سعد پاشا

---

[1] (هدی شەعراوی) کچی محمد پاشا سوڵتانە، ژنی علی شەعراوی پاشایە، دڵگیر ببوو بە ژنی حسین رشدی پاشا، کە فەرەنسی بووە، پەیوەندیەکی بە تینی هەبوەلەگەڵ ئەو ژنە فەرەنسیە، بە واتایەکی تر هەر پەروەردەی ژێر دەستی ئەو بووە بۆ کاریکی گرنگ. لە کاتی نوسینی ئەم نامیلکەیە، ئێستا لەسەر شاشەکانی تەلەفزیۆنی میسر، زنجیرەیەك پەخش دەکرێت وەك رێزلێنانێك لە (هدی شەعراوی) کە رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە، لە سەرکردایەتی کردنی پیلانی دژ بە حیجاب.

زغلول) و ئەویش بەرەو فەرەنسا کەوتە ڕێ، لە ساڵی (١٩٠٩) دا سەردانی پێشانگاکانی فەڕەنسای کرد و چاوی کەوت بە جل و بەرگەکانیان، کە سەرەتای راپەڕینی ئافرەتی ئەوروپی بوو، هیوای خواست بتوانێ ئەو شێوازە لە میسرِدا بەرپا بکات، ئینجا گەڕایەوە میسرِ و هەر کەلە فرۆکە دابەزی سەرپۆشەکەی فڕێ داو، یانەیەکی رۆشەنبیری ئافرەتانی دامەزراند بە ناوی (کۆمەڵەی پێشکەوتنی ئەدەبی ئافرەتان). وەلە قاهیرە بوو بە یەکەم سەرۆکی (یەکێتی ئافرەتانی میسری)، وە چەند دەنگێکی تر بەرزبوونەوە کە بانگەوازیان دەکرد بۆ سەربەستی و، بەردەوام کاریان دەکرد تا شۆری یۆلیۆ لە ساڵی (١٩٥٢) لە میسرِ بەرپابوو زیاتر بواریان بۆ رەخسا، بەتایبەتی لەو کاتەی کە (جمال عبدالناصر) هەموو ئەو داوایانەی کە ئافرەتان داوایان دەکرد پێیانی بەخشین، بەڵکو زیاتریشی پێ بەخشین! تەنانەت ئەو شتانەی کە هێشتا ئافرەتان خۆیان بیریان لێ نەکردبۆوە! بەتەواوی رێگەی پێدان لە بالاپۆشی فرێدان! . کەچی رۆڵی (نوال سعداوی)ە، هەر ئەوەندە لە وتەکانی دەخەینە بەر چاوان کەبەسەر بەژن و بالای (الحاد) دا هەڵدەڵێ و بەچاکە ناویان دەبات و دەڵێ: (ڕەوا نیە ئەوەندە خۆمان گۆشەنشین بکەین تا ئەو رادەیەی گومان و سەرزەنشتی بیرو بۆچوونی زانایانی (بەرزی) وەك فرۆیدو مارکس بکەین کە جیهان، دان بە چاکەو خزمەت گوزاری یەکانیان دادەنێت لە پێشخستنی کۆمەڵگای بەشەریەتدا)!

بەم جۆرە ئەو دەنگانە، کەسی وایان دەست کەوت، لە شوێنە جیاجیاکانی ولاّتانی عەرەبیدا، کە گوێیان بۆ شل بکەن بەم شێوەیە شۆڕشی (سفور) دەستی پێ کرد و کۆتایشی نەهاتووە. پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) راستی فەرمووە کە دەفەرمووێ: (لتتبعن سَنَنَ مَن کان قبلکم شبرا شبرا و ذراعاً بذراع حتی لو دخلواجحر ضب تبعتوهم قلنا یا رسول الله الیهود والنصاری؟ قال فمن؟!) (رواه البخاری و مسلم).

بەڵێ دەگەڕێنەوە سەر دابوو نەریتی میللەتانی پێش خۆتان، بست بە بست، گەز بە گەز (باڵ بە باڵ)، تا ئەگەر چوونە ناو کونی بزن مشکیشەوە! شوێنیان دەکەون، وتمان ئەی پێغەمبەری خودا مەبەستت جولەکەو دیانەکانن (گاورەکان)؟ وتی (صلی الله علیه وسلم) ئەی کێ؟! هەر ئەوانن. چ چەرخێکە؟ بەڵێ ئەمە چەرخی پاشە کشێ یە، کە بەربەرەکانی میللەتانی ئیسلامی دەکات، میللەتانی رۆژئاوا پلانمان بۆ دادەرێژن و ئێمەش لاساییان دەکەینەوە لە جل و بەرگ و گشت بوارەکانی تری کۆمەلاّیەتی، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە جیهان بوو بە گوندێکی بچووک، ئەو ڕواڵەتە جیهان گەرپە کاریگەریەکی زۆری کردە سەر ئافرەت و کۆمەڵگا، بەلاّم هەرچەندە ئافرەت شوێنکەوتووی ئەو دەنگە نامۆیانە بێت، بەهۆی ساویلکایەتیەوە، هەر دەبێ ڕۆژێک لە ڕۆژان وشیار ببێتەوە، ئاگاداری بێتەوە کە چ خلیسکێن و پیلانێکی بۆ سازاندراوە!؟ جا با تێکرا و وێکرابە چاوی دڵ لەم ئایەتە وورد بینەوە، بۆمان

روون دەكاتــەوە، كــە خۆدامــاڵین لــە جــل و بــەرگی حەشمــەت كارێكی شەیتانیە، خودا (جل جلاله) دەفـەرموێت: (يَا بَنِـي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَـاسُ التَّقْـوَى ذَلِـكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُـمْ يَـذَّكَّرُونَ * يَـا بَنِـي آدَمَ لَـا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ يَنْزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَـا سَوْآتِهِمَا إِنَّـهُ يَـرَاكُمْ هُـوَ وَقَبِيلُـهُ مِـنْ حَيْـثُ لَـا تَـرَوْنَهُمْ إِنَّـا جَعَلْنَـا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّـذِينَ لَـا يُؤْمِنُـونَ) (ألاعـراف: ٢٦–٢٧)، واتــە: ئەی نەوەی ئادەم، شەیتان ئێوەش لە خشتە نـەبات، هــەروەك باوك و دایكتانی لە خشتە بردو لە بەهەشتدا بـە دەركردنـی دان، لە كاتێكدا دەستی كرد بە داماڵینی پۆشاكەكانیان تا عەورەتیان پیشانی یـەكتر بـدات، بێگومـان شـەیتان و دارو دەستـەی ئێـوە دەبینن، لە شـوێنێكدا كـە (دنیایـە) ئێـوەش ئـەوان نـابینن، جـا دڵنیــابن كــە ئێمــە شــەیتانەكانمان كــردوون بــە دۆســتی ئــەو كەســانەی بــاوەر نــاهێنن. **(تەفـسیری ئاســان – لاپــەڕە (١٥٣)، چــاپی هەشتەم).**

## ((رۆژنـامەگەری و سفور))

رۆژنامەگەری بە هەموو بوارو بابەتەکانیەوە، گرنگیەکی زۆری داوە و دەدات بـە ئـافرەت و مەسـەلەکانی، مەبەستیـشی تـەنها شـکاندنی ئـەو ناوبرەیـە یەکـە ئاییـنی پـیرۆزی ئیـسلام داینـاوە لەسەر پرانسیپی پاراستنی ئافرەت، بۆ ئـەوەی نەکەوێتـە نـاو تـۆری دوژمنـان و نەبێتـە نێـچیرو، نەبێتـە بوکۆکەیـەك بـە دەستیانەوەو، هەروەها نەبێت بە ئامرازێکی رابواردن و تێکدان. هەروەکو (بروتوکولات الصهیون) بۆی دەچێت لـە ژێـر دروشمـی (ئازادیەکانی ئافرەت) و (مافی ئافرەت)دا، کە زۆربەی لێکۆڵینـە رەوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە و دەڵێن: (تا ئێـستاشی لەگەڵ دابێت ئافرەت وەك کالآیەك، جولەکەی جیهانی کاری پـێ دەکات و، رۆژنامەگەریش، تاکە هۆکارێکە بۆ جێ بە جێ کردنـی مەرامـەکانیان). دەتـوانین کـاری رۆژنامەگـەری لـە فریـودانی ئافرەتدا لەم چەند خالآنەدا پوخت بکەین:-

١- رەخـساندن و بلآوکردنـەوەی بـواری بەدەرخـستنی جەستە و هەلگەراندنـەوەی لـەو راستیەی کـە لەسـەری دروست کـراوە کـە فـیترە (فطـرة)یـە. گرینگـی دان بـە مۆدێلات و ئاهەنگەکانی شەوان و پێشبرکێ ی شاجوانی و بلآوبوونـەوەی دەنـگ و باسـی هونەرمەنـدان و راقسەچیەکان ...

٢- تێکەڵکردنی پیاوەتی و مێ یەتی و گۆڕاندنی نێر بۆ مێ و مێ بۆ نێر لە شێوازدا، بەو شێوەیەی کە پیاو جل و بەرگی ئافرەت بپۆشێ و ئافرەتیش جل و بەرگی پیاو.

٣- هاندانی ئافرەت لە بەکارهێنانی حەبی (منع الحمل)، کە بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە حەبانە (بە بێ سانسۆر)، هاندەرێکە ڕێگایەکە بۆ بڵاوبوونەوەی کاری نابەجێ و هەڵوەشانەوەی شیرازەی خێزان.

٤- بڵاوبوونەوەی چەندەها ڕووداوی پەیوەست بە (شەرەف). کەلە کۆمەڵگاکانی ئەوروپیەکاندا ڕوودەدات و، وای دەخاتە بەرچاو، کە ئەم جۆرە پەیوەندیانە شتێکی ئاساین و (مەسەلەی شەرەف و پاراستنی)، شتێکی بێ مانایەو نابێ خۆمانی لەسەر بێزار بکەین و! وای بڵاودەکەنەوە کە (حەرام) هیچ ڕۆڵێکی نیە لەو پەیوەندیانەدا، بەڵکو شتێکی سروشتیەو هیچ کارناکاتە سەر کۆمەڵگا! بەتایبەتی لەڕێگای زنجیرە دۆبلاژکراوەکاندا.

٥- بەرز ڕاگرتنی پلەو پایەی ئەکتەرەکان و دەیانکەن بە نموونەی بەرزی کۆمەڵ لە بواری جل و بەرگ و خواردن و داب و نەریتی ڕۆژانەیاندا.

٦- ڕەتکردنەوەی ڕۆڵی سەرپەرشتی پیاو بەسەر ئافرەتاندا.

٧- فێڵ و گەندەڵی کردن لە وەلامدانەوەی گیروگرفتی

ئافرەتان، بەوەی لە ئەنجامدانی تاوانی رەوشتیەوە روودەدەن دەخرێنە قالبی (ئازادی کەسایەتی) و هیچ کەس مافی ئەوەی نیە لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات بە ناوی بەدخویی یان ناپاکی! رۆژنامەگەری هەوڵی داوە و پشتیوانی دەکات لە بانگخوازانی ئازادی ئافرەت.

## (( حیکمەتی بالآپۆشی ))

خوای کار بەجێ، هەر وەکو بۆ هەموو بوارەکان سنوور و حوکمی داناوە، هەروەها سنووریشی داناوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی یەکانی ئافرەت و دوورخستنی گەندەڵی لێ یانەوە. بالآپۆشیش حوکمێکە لەو حوکمانەی، کە ئافرەتی باوەڕداری پێ پەیوەست کردوە. کە واتە کاتێ خودای گەورە باسی بالآپۆشی دەکات، روو لە ژنانی باوەڕدار دەکات بە (قل للمؤمنات) واتە (مؤمنات) و (حجاب) یان بالآپۆشی، دوو بەشن بەیەکەوە تەواوکەری یەکترن، جا ئەگەر ژنێك باوەرداری تەواو نەبێت هەڵبەتە بالآپۆشیش نابێت ....

## (( ئایەتەکانی بالآپۆشی ))

خودای گەورە بۆ زیاتر روونکردنەوەی واجب بوونی (حجاب)، چەند ئایەتی دابەزاندووە بۆ ئەوەی هیچ گومانێك دروست نەبێت لە جێ بەجێ کردن و پۆشینی بالآپۆشدا، چونکە هەندێ کەس دوودڵن و وادەزانن بالآپۆشی تەنها تایبەتە بە ژنەکانی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم). لەم چەند ئایەتانەدا زۆر راشکاوانە خوای بالآدەست روو لەگشت ژنانی باوەردار دەکات و

دەفەرمویت:- (وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) (النور: ٣١).

واتە:- ((بە ئافرەتانی باوەڕداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشاکردنی نامەحرەم و داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهو جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (دەم و چاو و دەست) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیان دا و جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی تەنها بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکیان نەبێت، یان خەزوورەکانیان نەبێت، یان کوڕی خۆیان نەبێت، یان کوڕی مێردەکانیان نەبێت، یان براکانیان نەبێ، یان برازاکانیان نەبێت، یان خوشکەزاکانیان نەبێت، یان ئافرەتێك نەبێت کە پەیوەندیان هەیە پێکەوە، یان ئەوانەش کە کەنیزەکانیانن (کەلە بارودۆخی تایبەتی دا هەبوون)، یان ئەوانەی کەلەماڵەکانتاندا دەژین و پێویستیان بە ئافرەت نیە (پیری، یان نەخۆشی،..) یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەت نیەو (ئارەزووی رەگەزییان بۆ دروست نەبووە و نازانن باسی عەورەت بکەن) نابێت ئافرەتانی

باوەڕدار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەوی (تا دەنگی خشل و پاوەنەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدارو خشڵدارن، کەواتە هەمووتان ئەی باوەڕداران بەرەو لای خودا و بەدەست هێنانی رەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی رزگارو سەرفراز بن)).

٢- (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) (الاحزاب: ٥٩).

واتە: (ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی باوەڕدار بڵێ: کەبە پۆشاکی بالآپۆش خۆیان داپۆشن ئەوە باشترین شتەکە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و (توشی گیرو گرفت نەبن) هەمیشە و بەردەوام خوالێخۆش بوو و میهرەبانە (لە کەموکوڕی رابردووتان خۆش دەبێت). لێرەدا لەو ئایەتانەدا چەند حیکمەتێکمان بۆ دەردەکەوێت کە دەتوانین لەم چەند خالآنەدا پوختیان بکەین:

١- پاك راگرتنی دڵ و دەروون لەو شتانەی کە هەستی حەزو ئارەزوو بۆ مرۆۋ دروست دەکەن، چونکە دڵی مرۆۋ هەرچەندە پاك و بێ گەرد بێت خاوەنەکانیان ناگەن بەو پلەیەی کە پارێزراو بن لەو بەسەر دڵ هاتنانەدا. وەیان بەجۆرێك وایان لێ بێت نەکەونە ناو تاوان لەکاتی بوونی هۆکارەکانی ئەنجامدانی تاوان. چونکە دەرخستنی جەستە (سفور)ی ئاگر لە

هەستەکان بەردەدات و حەزوو ئارەزووەکان دەرووژێنێ، هەر لەبەر ئەوەیە کە خودای خاوەن حیکمەت، ویستوویەتی ئەو دڵانە پاك کاتەوە و هۆکارەکانی ئەو بە دڵ هاتنە لە رەگەوە نەهێڵێت، بۆیە باڵاپۆشی بەسەر ئافرەتانی باوەڕدار سەپاندوە بە (ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ) (الاحزاب: ٥٣).

٢- حیکمەتێکی تری باڵاپۆشی، پاراستنی ژنانە لە فاسقان، چونکە حیجاب سام و شەوکەتێکی تایبەتی خۆی هەیەو، دەیپارێزێت لە فاسقان و لە پلانە شەڕاویەکانیان. وە باڵاپۆشی ئافرەت وەك قەڵغانێك وایە کە خۆی پێ دەپارێزێت، لە چاوتێبڕینی هەرزەکاران و دڵ پیس و مەرامە پیسەکان. هەروەها باڵاپۆشی وێنەیەکی پڕ لە ئاکارەکانی رەنگ دانەوەی بڕوا و شەرمە، وە دەرچوونی ئافرەت لە سروشتیەکەی کە پێیەوە بەندە، بە کارێکی دوژمن کارانە دادەنرێت بەسەر (فطرة)ەکەیدا، هەروەها بەسەر ئەو فرمانە خواییانەی کەلە گەردوون بڵاوی کردۆتەوە. بۆیە حەرامی کردووە کەپیاو خۆی بشوبهێنێ بە ژن و هەروەها حەرامیشی کردووە ژن خۆی بشوبهێنێ بە پیاو، چونکە هەریەکە لە پیاو و ژن بەرگی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەمەیە سنووری خوایە لە نێوان دروست کراوەکانیدا، هەروەها دروستکردنێکی دادپەروەرانەیە

که بگونجێت لەگەڵ چۆنیەتی پێکهاتەی هەریەکەیاندا.

٣- سەپاندی بالآپۆشی بەسەر ژناندا، رێز لێنانە لێیان،بۆ ئەوەی ژنایەتیان بپارێزرێت. مەبەستێکی تری بالآپۆشی ئەوەیە کە مێیەتی، نهێنیەکی کاریگەری پێکهاتەی ئافرەتانەو، (مێیەتی) لە ئیسلامدا چەمکێکی تەواوکەری پێکهاتنیەتی بەو چەمکە پیاو تەواوی پیاوەتی خۆی وەدەست دێنێت وەك رەگەزێکی کۆمەڵگای بەشەریەت، هەروەها ژنیش بەهەمان شێوە و پێوەر. بۆیە دەبێت (ژن) ژنایەتی خۆی بپارێزێت و پیاویش پیاوەتیەکەی خۆی، هەروکو خودای لێزان دەفەرمووێت:

(... هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ ....) (البقرة: ١٨٧).

هەربۆیە ئیسلام، زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە دەبێت هەریەکە لەو دوو رەگەزە،تایبەتمەندیەتی خۆیان بپارێزن، ئەگینا شوناسنامەی (فطرة)، دەردەکەوێت تا چ رادەیەك، سەرپێچی ناشەرعی دەکرێت دەرهەق بە جوانی رەوشت. جا توخوا ناشرین نی یە؟ کە دەبینین (ئافرەتانی موسوڵمان) بەو جوانیەی کە خودا پێیانی بەخشیوە لە کۆڵان و بازارو شوێنە گشتیەکاندا جەستەی خۆیان نمایشی خەڵکانی بێگانە دەکەن؟

## (( خوشكى بەرێزم چین ئەوانەی
## بالاپۆشت ( حیجاب )ت لێ قەدەغە دەكەن ))

خـودای گـەورە، كاتێـك فـەرمان بـە ئافرەتـان دەكـات بـە بالاپۆش و خۆداپۆشین، تەنها بۆ ئەوەیە كە ئافرەت بە پـاكی و رەوشــت بــەرزی بمێنێتــەوە و دوور بــن لــە ژێــر بارخــستن (اسـتغلال)و، نـەكرێن بـە كالآیـەكی هـەرزان بـەهاو، كـڕین و فرۆشـتنیان پـێ نـەكرێت و، نـەكرێن بـە مایـەی پـیس بـوونی و تێكدانی شیرازەی ژیان.

خوشـكی بـەڕێزم، جـا لێـرەدا بـا بەیەكـەوە، ئـەو هۆكـارو پاساوانە، شی بكەینەوە و لێیان بدوێین:

خوشكی بەڕێزم، چین ئەو پاسـاوانەی ڕێگـات لێ دەگـرن لـە حیجاب پۆشین؟

## پاساو ( العذر )ی یەكەم:

خوشكێك دەڵێت: من هێشتا ئـەو بڕوایـەم لا دروسـت نـەبووە كـە بـالآپۆش (حیجـاب) بپۆشـم، بـەلاّم سـوپاس بـۆ خـودا نوێـژ دەكەم، رۆژوو دەگرم، زەكات دەدەم و خێرو چـاكەش دەكـەم! لێرەدا لەو خوشكەمان دەپرسـین، ئایـا تـۆ دڵنیایـت لـەوەی كـە بـڕوات بـە ڕاسـتی و دروسـتی پـەیامی ئـاینی ئیـسلام هەیـە؟ بێگومــان دەڵــێ: بــەڵێ بــڕوام پێیــەتی، هــەروەها بــە خــۆ

داپۆشینیش، بە زمانیش دەڵێت: (لااله الا الله محمد رسول الله)، کەواتە، بڕوای بە ئیسلام هەیە، وەك دەستوور و یاسا بۆ ژیان و پەیڕە و پڕۆگرام بۆ مرۆڤایەتی. دیسان لەو خوشکەمان دەپرسین، ئایا بالآپۆش لە شەریعەتی ئیسلامدا هەیە یان نا؟ وە ئایا فرمانی خودای لەسەر نیە؟ ئەگەر ئەو خوشکەمان لە وەلأمی ئەو پرسیارانەماندا راستگۆبێت و عەودالّی راستەقینە بێت، لە وەلأمدا دەڵێت: بەڵێ ئەو خودایەی کە بڕوامان پێ ی هێناوە، فەرمانی بە بالآپۆشی فەرمووە، هەروەها پێغەمبەرەکەشی (صلی الله علیه وسلم) کە بڕوامان بە پەیامی پێغەمبەرایەتیەکەی هێناوە، فەرمانی بە (حیجاب) کردووە لە فەرموودەکانیدا. کەواتە ئێمە چ ناوێك لەو کەسانە بنێین کە بڕوای تەواوی بە ئیسلام و پەیامەکەی هەیە و لەهەمان کاتدا پەیڕەوی فەرمایشتەکانی خوداو پێغەمبەری خودا ناکات؟ ئەو خوشکە و نموونەی ئەو خوشکەمان دەبێ بزانن، ئەگەر بێت و لەسەر ئەو حاڵەتەیان بمێننەوە، ئەوا ناچنە ریزی ئەو کەسانەی کە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەیان دەفەرموێت: (إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (النور: ٥١) .

واتە: هەر کاتێك بڕواداران، گوێبیستی بانگهێشتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەبن بۆ جێ بەجێ کردنی هەر فەرمانێك، دەست بەجێ و دەم و دەست ئەنجامی دەدەن، هەر ئەوانەشن

سەرکەوتووی دنیاو دوارۆژ، کە پەلە دەکەن لە راپەراندنی ئەم فەرمانە، تەنها بەمەش باوەڕداران لە دوو ڕوان (منافق) جیا دەکرێتەوە.

وەلە شوێنێکی تردا پەروەردگار دەفەرموێت:

(وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا) (الاحزاب: ٣٣).

واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لە ماڵەکانی خۆتاندا بە سەنگینی بسرەوون، جوانی خۆتان بەدیار مەخەن بۆ پیاوانی بێگانە، هەروەکو ئافرەتانی بەر لە هاتنی ئیسلام، کەبە لەنجەو لار دەچوونە بازارەکان و جوانی خۆیان نمایش دەکرد. بەڵکو خودا فەرمانتان پێ دەکات کە نوێژ بکەن و زەکات بدەن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەر بن (صلى الله عليه وسلم). کەواتە لێرەدا دەتوانین لەو خوشکەمان بپرسین، کە چۆن لەو فەرموودانە تێگەیشتوون؟ ئایا بەم بەشەی قورئان رازی نیە... یان دەڵێ (نؤمـن ببعض ونكفر ببعض) (المائدة: ١٥٠).

واتە: (باوەڕمان بە هەندێکیان هەیەو بەهەندێکیان نیە) واتا (چۆن دەکرێت دوو شتی دژ بەیەک، لەیەک کاتدا کاریان پێ بکرێت؟ باوەڕهێنان و کوفر کردن! چونکە لادان و باوەڕ نەکردن بە هەندێك ئایەت لە ئایەتەکان، (کفرە). واتا چۆن دەبێت باوەڕت بە هەندێك لە ئایەتەکانی خودا هەبێت و کاری

پێ بکەیت و هەندێکیش لەو ئایەتانە پشت گوێ بخەیت، وەك جوولەکەکان؟ وەیان ئەو خوشکە بەم شێوەیە لە ئیسلام تێ نەگەیشتووە؟ کەواتە چۆن پەیڕەوی تێکڕای گشتی فەرمایشتەکان ناکات؟ چونکە هەر ئەو خودایەی فەرمانی داوە بە نوێژ و ڕۆژو و زەکات .... هتد، هەر ئەویشە فەرمانی داوە بە پۆشینی بالآپۆش بۆ ئافرەتان.

## پاساوی دووەم:

خوشکێکی تر دەڵێت: من بڕوای تەواوم بە بالآپۆش (حیجاب) هەیە، بەڵام دایکم ڕێگام پێ نادات بیپۆشم! (منیش لەوە دەترسم ئەگەر لە فەرمانی دایکم دەربچم ئەوا خودای گەورە سزام دەدات)!

خوشکی بەڕێزم، ئاشکرایە کەخۆشەویسترین کەس لای خودای گەورە، پێغەمبەرەکەیەتی محمد (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێت: (لا طاعة لمخلوق في معصية الله عزوجل) (أخرجه مسلم و أحمد).

واتە: گوێڕایەڵی کەسێك ناکرێت کەلە خودا یاخی بوو بێت. هەروەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە گوێڕایەڵی دایك و باوك لەو کاتەدا دەبێت، کە ئەو دایك و باوکە لەژێر فەرمانڕەوایی خودابن، هەر یەکێك لەوان ئەگەر لە سنووری فەرمانڕەوایەتی دەرچوون، ئەوا کار بە فەرمانەکانیان ناکرێت،

هەروەکو قورئانی پیرۆز بۆمان روون دەکاتەوە و دەفەرموێت:

(وَإِنْ جَاهَـدَاكَ عَلـى أَنْ تُـشْرِكَ بِـي مَـا لَـيْسَ لَـكَ بِـهِ عِلْـمٌ فَلَـا تُطِعْهُمَا) (لقمان: ١٥).

واتــه: خــودای گــەورە رێنماییــت دەكــات و دەفــەرموێت، هەرچەندە دایك و باوکیشت بن، (ئەگەر خوانەناس) بوون، هەوڵ و کۆششت لەگەڵدا بکەن و بۆ ئەوەی هـاوەڵ بۆ خـودا پەیدا بکەیت و هەڵت بگەڕێننـەوە، ئـەوا بـە گوێیـان نەکـەیت، چـونکە گوێڕایەڵی کەسێك ناکرێت کەلە خودا یاخی بووبێت.

کەواتە خوشکی بەرێزم چۆن رێگا بەخۆت دەدەیت کـە خـودا لـەخۆت برەنجێنــی لەبەرامبــەر رازی کردنــی دڵــی دایکێـك کـە پێچەوانەی ویستی خودا کاربکـات؟ چـونکە هـەر ئـەو خودایـەی تـۆو دایکـت و بـاوکتی دروسـت کـردووە هـەر بـۆ لای ئـەویش دەگەڕێینەوە.

## پاساوی سێیەم:

هەندێك لە خوشکان دەڵێن: توانای ماددی وامان نیە کـە جـل وبەرگەکانم بگۆڕم! یان (حیجاب)ی پێ بکـرم. لێـرەدا دوو جـۆر هەن کە ئـەو پاسـاوانە دێننـەوە: یەکـەمیان راسـتگۆو دڵـسۆزە، دووەمیـان راسـتگۆ نـی یـەو تـەنها نیـازی پاسـاو هێنانەوەیـەو، دەیـەوێ باڵاپۆشـێکی گـران بـەها و سـەرنج راکێـشەری دەسـت کەوێت، کەزیاتر بەرچاو بێت بێ ئەوەی بیر بکاتەوە لـەوەی کـە

بالاپۆش، مەرج و نیشانەی خۆی هەیە، کە دەبێ بەرگی شەرم و حەیا بێت نەك خۆ وەدەرخستن. بەو خوشکە راستگۆیەمان دەڵێین ئایا دەزانیت کە ئافرەتی بڕوادار نابێت لەماڵەوە دەربچێت مەگەر بە مەرجی پێویست نەبێت؟ پۆشاکەکەشی دەبێ رێك خۆیان بگرنەوە لەگەڵ ئەو مەرجانەی کە شەرع بۆی داناوە.

هەروەها زۆریش گرنگە بۆ ئافرەتی بڕوادار، کە دەبێ مەرجەکانی جل و بەرگی دەرەوەی ماڵ بزانێت، هەروەك چۆن هەوڵ دەدات لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا شارەزایی پەیدا بکات دەبێ ئاواش هەوڵ بدات، ئەو مەرج و زانیاریانە بزانێت چونکە (العبادة بِلا علم كعبادة الاصنام).

واتە: خواپەرستی بە بێ ئاگاداربوون لە زانستە شەرعیەکان وەك بت پەرستی وایە.

وە ئەو هەموو هەوڵ و کۆششانەی، بۆبە خوداپەرستی دەژمێردرێت و لە سزای دوارۆژ دەیپارێزێت، وە بەگوێرەی ئەو خوشکەی کە دەڵێت توانای ماددیم نیە، ئەگەر راست بکات، ئەوا با نییەتی لێ بێنێ و (انشاء الله) خوای بالادەست رێگای بۆ ئاسان دەکات و، زیاتر لە خودا بپارێتەوە و داوای لێ بکات، بێگومان خوداش یارمەتی دەدات (وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا (٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ) (الطلاق: ٢).

واتە: هەر کەسێك پارێزکاری بکات و لەخوا ترس بێت، ئەوا بێگومان خودای گەورە دەرگای رزگاری بۆ دەکاتەوەو رۆزی و

رزقێکــی وای پــێ دەبەخــشێ، لەرێگایــەکی رەچــاونەکراو کــە هەرگیز بیری لێ نەکردبێتەوە.

## پاساوی چوارەم:

هەندێکی تر لە خوشکان دەڵێن: ئاو و هەوای وڵاتمان گەرمەو بـە پۆشـینی (حیجـاب) ئـەو توانایـەمان نـابێ کەبەرگـەی ئـەو گەرمیە بگرین، بەتایبەتی لە وەرزی هاویندا !(سبحان الله)!

بەو جۆرە خوشکانە دەلـێین ئەگـەر مەبەسـتمان رازی کردنـی خودایــە و بــە ئومێــدی بەهەشــتین، ئــەوا وەدەســت هێنــانی بەهەشت، کارکردنە بۆ ئەو مەبەستە، هەروەها دەبێ ئەو ئـازارو ناخۆشیانەی ژیانی دونیا بەهەند وەرنەگرین، بەتایبـەتی ئەگـەر ببنە مایەی رێ خۆشکەر بۆ گەیـشتن بـە بەهەشـتی پـڕ لـە نـازو نیعمەتی نـەبڕاوەی خـوای میهرەبـان. بەواتایـەکی تـر بەهەشـت گران بەهایەو دەبێ ئەو بەهایە بدەین. دۆزەخیش، دەورە دراوە بە لەزەت و رابواردن لە ژیانی دونیادا.

خوشـکی بـەرێزم، ئـەو گەرمایـەی دونیـا بـەراورد نـاکرێ بـە گەرمای رۆژی دوایی و وەستان لـە گۆڕەپـانی لێ پرسـینەوە لـەو کارانــەی کەلــە ژیــانی دونیــادا ئــەنجاممان داون بــە گــەورەو بچووکیەوە، بۆیە هەردەم دەبێت ئەو راستیەمان لەبەرچاو بێـت کە خودای گـەورە (جـل جلالـە) دەفـەرمووێت: ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾﴾ التوبـة: ٨١ واتــە: ئەگــەر لــە

گەرمای دونیا دەترسن نەوەك دووچاری ئازارو ئەشكەنجە بن، خۆ ئاشكرایە كە تین و گەرمای دۆزەخ زۆر زۆر ... گەرمترە لەوەی كە ئێوە باسی لێوە دەكەن، ئەگەر تێ بگەن. كەواتە مرۆڤی ژیرو دانا، هەرگیز نابێ دوای ئەو جۆرە پساوانە بكەوێت، چونكە ئەمە تەڵەو فێڵی شەیتانە دەیخاتە ناو دڵی تا بیخاتە ژیانی گومڕایی و سەر لێشێواوی. هەروەها لەچەند شوێنێكی تردا خوای گەورە باسی ناخۆشی و ئەشكەنجەكانی رۆژی دوایی و دۆزەخمان بۆ دەكات، خودا گشتمان پەنا بدات .

## پاساوی پێنجەم:

هەندێك لە خوشكان دەڵێن: ئەگەر ئێستا بالآپۆش (حیجاب) بپۆشین، دەترسین بەیانی وازی لێ بێنین، چونكە خوشكانێكی وامان بینیون؟

خوشكی رێزدار، ئەو جۆرە بیركردنەوانە پێیان دەڵێن وەپێش كەوتنی رووداو! چونكە ئەگەر هەموو كەسێك وا بیری بكردایەوە ئەوا، لەوانەیە ئێستا زۆربەی موسوڵمانان، وازیان لە نوێژو ڕۆژوو و فەرمایشتەكانی تر بهێنایە. دیسان دەڵێین، ئەمەش داوێكەو تەڵەیەكە لە تەڵەكانی شەیتان، بۆ

ئەو كەسانەی دەڕازێنێتەوە تاوەكو ببن بە نێچیر، ئەگینا ئەو هەموو خەیاڵآنە بۆ چی؟خوافرمان دەكات دەڵێ:بپۆشە...واتە...بپۆشە.

تۆ به پۆشینی (حیجاب) کارێك ئه‌نجام ده‌ده‌یت که فه‌رمانی خودا به جێ ده‌گه‌یه‌نیت، به دڵێکی پڕ له ئیمانه‌وه به (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا) (البقرة: ٢٨٥) وه‌ڵامی فه‌رمانی خودا ده‌ده‌یته‌وه، به به‌رده‌وام بوون له‌سه‌ر کاری چاك و خواپه‌رستی، هه‌رگیز دوودڵی و گومان له دواڕۆژ به خه‌یاڵتدا نه‌یه‌ت ئه‌وه نیه خودا ده‌فه‌رموێت: (وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ) (البقرة: ٤٥).

واته: داوای یارمه‌تی و هاوکاری له خودا بکه‌ن بۆ ڕاپه‌ڕاندنی گشت کاره‌کانتان به ئارام گرتن و نوێژکردن و دان به‌خۆدانان له‌سه‌ر هه‌موو ئه‌و فرمانه شه‌رعیانه‌ی که جێ به‌جێ یان ده‌که‌یت به‌تایبه‌تی نوێژ که کۆڵه‌گه‌ی ئایینه، چونکه نوێژکردن به‌و مانایه‌ی که هه‌یه‌تی له‌راستیدا زۆر گرانه ئه‌نجام دانی، ته‌نها له‌سه‌ر ئه‌و که‌سانه نه‌بێت که‌به ته‌واوی ملکه‌چی بۆ خودا ده‌رده‌بڕن. چونکه ده‌ست گرتن به قورئانی پیرۆز و سونه‌ته‌کانی پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم)، دوورکه‌وتنه‌وه له هاوڕێ ی خراپ، هه‌رگیز وات لێ نایه‌ت که ئه‌و جۆره بیرو خه‌یالأنه به دڵتدا بێت، خوا (جل جلاله) ده‌فه‌رموێت: (وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا) (النساء: ٦٦).

واته: ئه‌گه‌ر بێت و ئه‌وانه‌ی، کاره‌کانیان ئه‌نجام ده‌ده‌ن به گوێره‌ی ئه‌و فه‌رمانانه‌ی که پێیان ده‌درێت له لایه‌ن خودا و پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی، ئه‌وا ئه‌نجامێکی باشی ده‌بێت هه‌م له دونیاو هه‌م له‌رۆژی دواییدا،باشتریشه بۆ چه‌سپاندنی باوه‌ڕ له‌ناو دڵه‌کانیاندا.

## پاساوی شەشەم:

خوشکێکی تر دەڵێت: ئەگەر (حیجاب) لەبەر بکەم، لەوانەیە کەس نەیەتە خوازبێنیم! بۆیە وای بە باش دەزانم کە ئەو (حیجاب) پۆشینەم دوابخەم بۆ دوای شوکردنم؟! خوشکی بەڕێز: ئەو پیاوەی کە تۆی بە جل و بەرگی ناشەرعی گەرەکە، ستەمە تۆ ببیت بە هاوسەری ژیانی، شایەنی ئەوەش نیە بێتە خوازبێنیت، چونکە ڕەچاوی دواڕۆژی تۆی نەکردووە و بیری لەوە نەکردۆتەوە کە هاوکاریت بکات بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودای گەورە، ئەگەر ژیانی هاوسەریت لە ژێر فەرمایشتی خودای گەورە بنیات نەنرێ، دەبێت چ جۆرە گرفت و نارەحەتی و ئەشکەنجەی بەدوادابێت؟ نەتبیستووە خودای پەروەردگار بەو هەموو هەڕەشەوە دەفەرموێت: (وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى) (طه: ١٢٤)، واتە: هەر کەسێك لابدات و کارنەکات بەو فەرمانانەی کە بۆ پێغەمبەرەکانم ناردووە لە یاساو حوکمەکان، ئەوا لەژیانی دونیادا ژیانی تەنگ و پڕ لە ئەشکەنجە دەکەم، هەرچەندە لەڕواڵەت بە خوا پێدراو بێتە بەر چاوان، لەبواری خواردن و خانو و پێویستییەکانی تری ژیان، لەراستیدا ئەو جۆرە کەسە، لە دڵەڕاوکێیەکی توندا دەژیت و هەست بە ناخۆشی دەکات. بۆیە ئەو پیاوە غەم خۆری دوارۆژ و سەرئەنجامی ژیان و دوارۆژی تۆ بێت، دەبێ باشیش بزانیت، کە شووکردن بە

قەدەری خودایە، باوەڕیش بە قەدەر لە بنچینەکانی ئیمانە.
شووی باش، پیاوی باش، یەکێکە لە نیعمەت و بەخششەکانی خوای میهرەبان و، هەر خودا (تەقدیر)ی دەکات. ئەگەر بڕوات وانەبێ، دەبێ مراجەعەیەکی تەواوی ئیمانەکەت بکەیتەوە، خوداش چۆن ئارەزووی لێ بێت، هەروا دەبێت، هەر بە تەقدیری خودای گەورەشە، چەندین کچی بالاپۆش شوو بکەن و چەندین کچیش کە بەرگی ناشەرعیان لەبەردایە بمێننەوە و بە هەناسەی سارد سەربنێنەوە.

## پاساوی حەوتەم:

هەندێکی تر لە خوشکان کە جوان لە قورئان حالّی نەبوونە دەڵێن: خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: (وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ) (الضحى: ١١) جوانی ئافرەتیش نیعمەتێکی خوایە، بۆیە دەرخستنی ئەو نیعمەتە، پەیڕەو کردنی ئایەتێکی قورئانەو ئەو جوانیەمان ناشارینەوە!.! لێرەدا وادیارە ئەو خوشکە زۆربە چاکی پەیڕەوی فرمایشتەکانی خودای گەورە دەکات و! بەو جۆرە قورئان راڤە دەکات. کە چۆن لەگەڵ حەزو ئارەزووەکانیدا بگونجێت، دەیگونجێنێت، هەروەك خۆی پێ ی باشە، ئەو جۆرە خوشکە، بەم جۆرە لەم ئایەتە گەیشتووە و بەوجۆرە پەیڕەوی دەکات، ئەی باشە، دەبێ چۆن لەم ئایەتە گەیشتبێ کە خودا دەفەرموێت: (ولا يبدين زينتهن الاما ظهر منها)؟ واتە:خۆیان

وەدەرنەیەخەن بۆ کەسانی بێگانە مەگەر ئەوەندە نەبێت کە دیارە، ئاماژەیە بۆ (دەم و چاو دەستەکان تا مەچەك)، ئەو جۆرە لێکدانەوەیە وەك ئەمە وایە، رۆژێك لە شەیتانیان پرسی، هیچت لە قورئان لەبەرە؟ ووتی بەڵێ، ئەم ئایەتەم لەبەرە کە خودا دەفەرموێت: (فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ) (الماعون : ٤) واتە: دۆزەخ بۆ نوێژکارانە .... ووتیان هیچی ترت لەبەر نیە؟ وتی بەڵێ: (وَلَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ)(النساء : ٤٣) واتە: نزیکی نوێژ مەکەون و ئەنجامی مەدەن! پێیان وت باشە، بۆ ئەم ئایەتانە تەواو ناکەیت؟ شەیتانووتی: خۆ خودا داوای نەکردووە قورئان گشتی لەبەر بکەین، بەڵکو دەڵێت: (فَاقْرَءُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ) (الزمل : ٢٠) واتە: هەر ئەوەندە بخوێنە کە بۆت دەکرێت و بۆت مەیسەر دەبێت. خوشکی بەڕێز، ئەو جۆرە پاساو و لێکدانەوەی تۆ بۆ قورئان، وەك لێکدانەوەکەی شەیتان وایە. چونکە نیعمەتی ئیمان گەورەترین نیعمەتی خوایە بۆ مرۆڤ، بۆیە دەبێت لە ڕووخان و لاوازبوونی بیپارێزین و سەقام گیری بکەین و ڕێگا نەدەین بە نەفس و شەیتان لاوازی بکەن و بەرەو هەڵدێرمان نەبەن.

## پاساوی هەشتەم:

هەندێك لە خوشکان دەڵێن: دەزانین خۆداپۆشین فەرمانی خوایەو واجبە لەسەرمان، بەڵام هەرکاتێك خوای گەورە

(هیدایـەت)ی دایـن، ئـەوا پـەیڕەوی دەکـەین و دەیپۆشـین! لـە وەڵامدا، بەو خوشکە بەرێزەمان دەڵێین: ئایا تـاوکو ئێستا تـۆ هیچ هەنگاوێکت ناوە بەرەو (هیدایـەت) بوون؟ (وقَدْ جَعَلَ اللّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا) (الطلاق: ٣) وەیـان هۆکارەکـانی بـەرەو (هیدایەتت) گرتۆتەبەر؟ ئەگەر تۆ ئارەزووی گەشتێکت هـەبێت، هۆکاری گواستنەوەی بۆ ئامـادە ناکـەیت؟ وە ئەگـەر نـەخۆش بکـەویت سـەردانی پزیشك ناکـەیت؟ بـۆ دەسـت نیـشانکردنی نەخۆشـیەکەت و، دیـاری کردنـی دەرمـانی تایبـەت بـە نەخۆشـیەکەت؟ بێگومـان وەڵامەکـەت تـەنها (بـەڵێ) دەبێـت. (هیدایەت) یش، هەر بەو شێوەیەیە، هەر لە دوعاکردن و تێکەڵ بوون بـە توێژی خوشـکانی خـاوەن بـڕوا و چـاکە خـواز و گـوێ گرتن لە وتار و خوێندنەوەی کتێبی ئاینی و هۆکارەکانی تر، کە کـاری (هیدایـەت)ت بـۆ ئاسـان دەکـەن و دەگـەیت بـە کـاروانی خواناسان و، گەیشتن بە وەدەست هێنانی سۆزو میهرەبانیـەتی خوای میهرەبان و ەبەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتی نەبڕاوە.

## پاساوی نۆیەم:

هەندێك لە خوشـکان، وا بـیر دەکەنـەوە کـە جـارێ بـچوکن و گـەنجن و کـاتی حیجـاب پۆشـینیان نـەهاتووە! ئـەو جـۆرە خوشـکانە وا حـاڵی بـوون کـە خۆداپۆشـین، تـەنها بـۆ بـە ساڵاداچـووانەو گەنجـەکان ناگرێتـەوە! خوشـکی بـەرێزم بـیر

بکەرەوە، ئەم جۆرە لێکدانەوەیە زۆر ترسناکە، چونکە هەر یەکێك لە ئێمە و گیانلەبەران بە تێکڕایی، بۆی هەیە لە هەر کاتێك و لەهەر چرکەیەکدا ئەم دونیایەو ئەم ژیانە بەجێ بهێڵێت و مەرگ کۆتایی بە ژیانی بهێنێت. کەواتە بە چ بڕیارێك ئەو مافە بەخۆت دەدەیت کە چاوەڕوانی ژیانی بەیانیت بکەیت؟. (فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ) (الأعراف: ٣٤) ئەم ئایەتە پیرۆزە هەڕەشەیەکی گەورەی خوای گەورە بەخۆیەوە دەگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت لێرەدا بگوترێت هەر کاتێك لەناوچوون، یان مردنی کەسێك، یان کۆمەڵێك هات، ئەوا بەهیچ جۆرێك لەناوچوونیان، دواناخرێت تەنانەت بۆ کەمترین کاتیش. خوشکی بەڕێز، تۆش باش دەزانیت مردن جیاوازی ناکات لەنێوان پیرو منداڵ و گەنج و نەخۆش و لەش ساغ. کەواتە دەبێت خۆت ئامادەبکەیت بۆ پێشوازی کردن لە گیان کێش (ملك الموت)، لەهەموو کات و ساتێکدا. بەڕاستی مردن، بەو جۆرە جل و بەرگە ناشەرعیە، شەرمەزارییەکی زۆری لەدوایە، هەر لەسەرەتاوە، وەڵامی ناو گۆڕت چۆن دەبێت؟ خوشکی بەڕێز زووکەو روو لە دەرگای رەحمەتی خودا بکەو داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، چونکە خوایەکی میهرەبانت هەیە و لەهەموو کاتێکدا دەتوانیت بگەڕێیتەوە و پەلە بکە (وسَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ) (الحديد : ٢١)، واتە: پەلە بکە بەرەو لێ خۆشبوون و بەهەشتێکی فراوان کە فراوانیەکەی هێندەی فراوانی ئاسمان و زەویە. خوشکی

بەریز،خوای خۆت لەبیر مەکە، تا ئەو لەبیرت نەکات (نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ) (التوبة: ٦٧) (وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ) (الحشر: ١٩) نابێ ئەوەندە ئومێدمان بە تەمەن درێژی هەبێت، ئەگەر شەوت کردەوە، نابێ بەهیوای ژیانی بەیانی بیت، هەروەکو پێغەمبەری پێشەوامان (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (مالي وللدنيا الا كراكب استضل تحت شجرة فتركها)، واتە: نموونەی من و دونیا وەك سوارێك وایە کەلە ژێر سێبەری درەختێك بحەسێتەوە و دوایی جێ ی بهێڵێت. برادەرێکم بۆی گێڕامەوەو وتی: لەم ماوەیەدا کابرایەکی تەمەن (٧٠) ساڵە خانوویەك دروست دەکات، کە تەواو دەبێت لە ئەندازیارەکە دەپرسێ، ئەرێ کاکەی ئەندازیار، ئەم خانووە چەند ساڵ خۆی رادەگرێت؟ ئەندازیاریش بەگوێرەی پێکهاتەکانی خانووەکەو ئەو زانیاریانەی کە هەیەتی وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: تا (٥٠) ساڵی تر هەر قسەی لەسەر نیە. خاوەن خانوەکەش دەڵێ: دەباشە، ئەو کاتەش بۆیاغێکی خەفیفی دەکەینەوە! سەیرە (٧٠+٥٠=١٢٠) ساڵ و هێشتا بەهیوای زیاترە! خۆداپۆشینی ئافرەتی موسلمان، پێویستی بە خۆ راهێنان هەیە، پێویستە لەسەر دایکان و باوکانی موسلمان، هەر لە منداڵیەوە کچەکانیان لەو جۆرە پۆشاکە رابهێنن وەك لایەنێکی گرنگی پەروەردەکردن، تا لەکاتی گەورە بوونیان لایان گران نەبێت، هەروەکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: لە فەرموودەیەکی رێنمایی کردنی (أسماء) —خوا

لێ ی رازی بێت- (یا أسماء ان المراة اذا بلغت الحیض لم تصلح ان یرى منها الا هذا واشار الى وجهه وكفیه) (أخرجه أبو داود)، واتە:(ئەی ئەسما، ئەگەر کچ بلوغی بوو، بۆی ڕەوا نیە،جگەلەمەی لێ ببینرێت، ئاماژەیە بۆ(دەم و چاو و دەستەکانی تا مەچەك) هەروەکو ئاشکراشە کە تەمەنی پێگەیشتنی کچان لە نێوان ١٢-١٣ ساڵی دایە، بۆیە وا چاکە کە دایکان، پێشەواو پێشەنگ بن بۆ کچەکەیان لە پۆشینی پۆشاکی شەرعیدا،بەم شێوەیە دایکان و باوکان، زیاتر دڵنیا دەبن لە دواڕۆژی کچەکانیان، هەم لە دونیاو هەم لە ڕۆژی دواییدا. لە لایەکی تریشەوە خۆیان رزگار دەکەن لەو بەرپرسیەتیە گەورەیەی کە لە سەریانە بەرامبەر خوای گەورە. بەدایکان دەڵێین :ئەگەر، کچەکەت لا خۆشەویستەو هەوڵی بەختەوەری دەدەیت لە دونیا، دەبێ لەوەش زیاتر هەوڵ بدەیت بۆ بەختەوەرکردنی لە دوارۆژدا، هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: (یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِیكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَیْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا یَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَیَفْعَلُونَ مَا یُؤْمَرُونَ) (التحریم: ٦)، جا زووکە دایکی خۆشەویست هەنگاو بنێ بەرە و رازی کردنی خوای گەورە و جێ بەجێ کردنی ئەو بەرپرسیەتیەی کەلەسەر شانتە و خۆت و منداڵەکانت بەختەوەر بکە لە دونیاو لە ڕۆژی دواییدا.

نەوەك وەك ئەو دایکەی کەلە تەمەنی (٥٠) ساڵی دایە و خۆی تەواو داپۆشیوە، کە هیچ کەسێك سەیری ناکات، بەلام

کچەکەی (١٤)ساڵیە و جوان جوان ئارایشی کردووە و بەنیوە رووتی و دوای خۆی داوە! توخوا لەمە سەیرتر هەیە؟ گوایە پابەندی فەرمانی خوایە!

## پاساوی دەیەم:

خوشکێکی تر دەڵێت: لەوە دەترسم ئەگەر حیجاب بپۆشم، پێم بڵێن سەر بە فلأن کۆمەڵ و لایەنە، منیش حەز لە حیزبایەتی ناکەم!!

بۆ وەلأم دانەوەی ئەو جۆرە پاساوانە، یەکسەر دەچینە سەر بابەتە زێڕینەکانی تایبەت بەو جۆرە پاساوانە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ) (الأحزاب: ٣٧)، واتە: لە خەڵك دەترسن، کەچی خوا رەواترە کەڵێ ی بترسێیت. جێ بەجێ کردنی فەرمایشتەکانی خودا هیچ پەیوەندیەکی نیە بە لایەن و کۆمەڵێکی دیاری کراو، بەڵکو ڕاستەوخۆ بەندە بە فەرمانەکانی خوا. لە ڕاستیدا دوو حیزب هەن کە زۆر لەیەك دوورن، ئەوانیش یەکەم: (حزب الله)یە حزبی خودا، ئەو جۆرە کەسانەن کە گوێڕایەڵی سەرجەم فەرمایشتەکانی خوای گەورەن، بێ حیساب کردن بۆ هیچ قسەو تانەی کەسانی تر، خوای گەورەش، هەمیشە پشتیوانی ئەم (حزب)ە یە. حیزبی دووەمیش حیزبی شەیتانە، حیزبی شەیتانیش، هەروەکو دیارە، شوێن کەوتووی شەیتانن و،

شەیتانیش دوژمنی هەرە گەورەی ئادەمیزادەو، هەر کەسێکیش شوێن کەوتووی نەفس و شەیتان بێت، لە دڵەڕاوکێ و پشێوی و نائاسوودەیی دا دەژی، چونکە لە خوای گەورە یاخی بووەو، خواش (جل جلالە) بەڵێنی خۆی بەسەریاندا دەسەپێنێت لە دونیاو رۆژی دواییدا، جا هەرکەسێك مەبەستی بێت بچێتە ڕیزی (حزب الله)، هیواو ئومێدی ڕازیکردنی خوای گەورە بێت، بێ سێ و دوو کردن، دەبێت ملکەچ بێت بۆ فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیە وسلم). (حیجاب) بالأپۆشیش یەکێکە لە جێ بەجێ کردنی ئەو فەرمانانە، بە پێچەوانەی ئەمەش، دەرخستنی لەش و لاری ئافرەت، یاخی بوونێکی ئاشکرایە لە فەرمانەکانی خواو، جلەوی خۆیان دەدەن بەدەست شەیتان، بێ گومان بەرەو هەڵدێرو ژیانێکی پڕلە ئازارو ئەشکەنجەیان دەبات لە ژیانی هەنووکەو دوارۆژیدا. خوشکی بەرێز جا هەرچی زووە ڕوو بکەرە دەرگای خوداو داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەو ئەم فەرمانانەی خودا لە دڵدا بگرە کە دەفەرموێت: (فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ) (الذاريات: ٥٠)، کە واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای خواو فەرمانەکانی و، من ئاگادارکەرەوەی ئێوەم بە بەڵگە. لە لایەکی تریشەوە لەوانەیە هەندێك لە خوشکان بڵێن، جگە لەوەش هەنێك لە دەستە خوشکەکانمان، یان دەوروبەرمان لەوانەیە گاڵتەمان پێ بکەن و بێزارمان بکەن بە تانە لێدان و ناو و ناتۆرەی جۆراوجۆر. بەر لە هەموو شتێك پێویست بەوە ناکات تۆ لەو جۆرە کەسانە نزیك

ببیتەوە و بەو شێوەیە لەگەڵیاندا تێکەڵ ببیت، ئەگەر هەر نەکرا ئەوا قورئانی پیرۆز، زۆر بە ڕاشکاوی ڕێگامان بۆ ئاسان دەکات لە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە.

(جل جلاله) کە دەفەرموێت: (أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ (٢) وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ) (العنكبوت: ٢-٣). خوشکی بەڕێز، وەدەست هێنانی هەر بڕوانامەیەك، پێویستی بە خۆ ئامادەکردن هەیە بۆ وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانەی کە ڕووبەڕووی دەبنەوە، دیارە ئەوەش بەئاسانی ناکرێت، بەڵکو دەبێت هەموو ئەو ماندووبوون و ئێش و ئازارە لەبەر چاو بگرن و بە باشی رەچاو بکرێت. هەروەکو ئافرەتانی موسوڵمانی چەرخانی زوو، پەیڕەویان دەکرد بۆ رازی بوونی خوای میهرەبان، هیچ جۆرە ناخۆشیەکی ژیانیان لەبەر چاو نەبووە، بۆیە تۆش هەوڵ بدە بەرەنگاری هەموو ئەو شتانە ببیتەوە بەو ئیمانەی کە هەتەو، ئەو ئازارانە بیر خۆت بەرەوە، هەروەك پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) تووشی هاتوون و ناحەزانی حەق، پێ یان کردوون، کەچی لە راگەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەیان سارد نەبوونەتەوە و زیاتر سووربوونە لەسەر بانگەوازەکەیان و ڕێنمایی کردنی خەڵك. تۆش هەوڵ بدە بەرێگای گفتوگۆی هێمنانە، ببیت بەمایەی (هیدایەت) یان، ئەگەرنا دەتوانیت بڵێیت (لکم دینکم ولی دین). دەکرێ ئەو جۆرە تێکەڵی یەی لەمەوبەریان نەکەیت و دەستە خوشکی

وابکـه بـه هاوڕێـت، کـه هـاوبیروڕاو ئیمانـت بـن و بتـوانن سـوود بەیەکتر بگەیـەنن، دروشمـی (سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ) (القـصص: ٥٥). ببـه سـومبلی خۆیـەك لاکردنـەوەو ئـامێری کۆنترۆلکردنی پەیوەندیـەکانت لەگـەڵ دەوروبـەردا هـەروەها بـه هەڵسوکەوت و ڕەوشتی بـەرزو ڕەفتـاری جـوان و ئیمانـەوە، لـه نێوان خوشکانی بالآپۆش دا، دەبیت به مایەی سەرنج ڕاکێشانی ئەوانی تـریش و، دەبنـه کلیلـی چـاکه بۆ دەورەبـەر و ڕێنمـایی کردنیان و ڕزگارکردنیان لەو ئاکامـه ترسناکەی کـه چـاوەڕێ ی یـاخی بـوان دەکـات، تـا وایـان لێ دێـت خۆیـان، بـیر لـه خۆیـان دەکەنـەوە کەلـه چ حاڵـەتێك دان و چ جـۆرە بـەرگێکیان پۆشیوە؟، خۆ ئەگەر (خوانـەکات)، تـۆ چـوویته سـەر ڕەفتـاری ئەوان، ئـەوا بێگومـان زیـاتر بێـزارت دەکـەن و زاڵبـوونی خۆیـان بەسەر

تـۆدا رادەگەیـەنن و دیـارە توانیویانـە دەسـت لـه نـاوەوەی کەسایەتی تۆ بناخنن و بەرەو داواکاری ئـەوان چـوویت و، ئـیتر دەبێ بەپێی خشتەی داڕێژاوی ئـەوان ژیـان بەسـەر بـەریت و تـا وای لێ دێـت، هـەنگاو بـه هـەنگاو لـه پـەیامی ئیـسلام دوورت دەخەنەوە و بەمەش زیانێکی زۆر دەکەیت، بۆیـه خـوای گـەورە دەفەرموێت: (ولن ترضـى عنـك اليهـود ولا النـصارى حتـى تتبـع ملتهم) (البقرة: ٩)، واتـه: جولەکـەو دیانـەکان وازت لێ نـاهێنن و لێت ڕازی نابن تا نەچیته سەر بەرنامەی ئەوان.

## پاساوی یازدەهەم:

جۆرە خوشکانێکی تر هەن دەڵێن: چەند ئافرەتێك هەن (حیجاب) دەپۆشن کەچی کاری بەدرەوشتی ئەنجام دەدەن و لەژێر ئەم بەرگە خۆیان حەشارداوە، بۆیە ئێمە حیجاب ناپۆشین! ڕاستە، لەوانەیە هەندێ ئافرەتی وا هەبن لەناو کۆمەڵگادا، جۆرە هەڵەیەکیان کردبێ، بەڵام نابێتە پاساو کە بەرگەکە (حیجاب) تاوانبار بکرێت، ئەگەر بێت و ئافرەتێکی ناپاك پەنا بباتە بەر (حیجاب) بۆ کارێکی ناڕەوا، ئەوا نەناوی بەرگەکەو، نە رێزی ئیمانداران لەکەدار ناکات. خوشکی بەرێز، ئەو کەسەی بەرگی سەربازی دەکاتە بەر دەبێ ببێتە نموونەی دڵسۆزی و فیداکاری بۆ بەرگری کردن لە نیشتمانەکەی، ئەگەر هاتوو سەربازێك، ناپاکی کرد لە بەرگری کردن لە نیشتمانەکەی لەکاتی پێویستدا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بەرگەکە یان نیشتمانەکە نا پاکەو، ئیتر نابێ کەسی تر بچێتە ڕیزی سەربازیەوە، چونکە تاکە سەربازێك خیانەتی کردووە! تۆش نموونەی سەربازێکی دڵسۆزیت بەم بەرگە پیرۆزەوە، وە بەرگری لە خودی کەسایەتی خۆت دەکەیت، لەبەردەم ئەو هێرشانەی دەکرێنە سەرت کە دوژمنانی ئیسلام پێ ی هەڵدەستن، بە بەرپاکردنی جۆرەها پڕوپاگەندەی بێ بەڵگە. بەڵێ ئاینی ئیسلام فەرمان بە (حیجاب) دەکات و هانمان دەدات بە پۆشینی و، دەبێ مافی ئەو بەرگە پڕ حەشمەتە بدەین بە هەڵسوکەتی جوان

و ڕەوشتی بەرزی ئیماندارانەوە، وە ئەوانەی لەژێر (حیجاب)ەوە کاری ناڕەوا ئەنجام دەدەن بێگومان، پەردەی ڕوو ڕەشییان لەسەر هەڵدەماڵدرێت و ڕیسوا دەبن و (حیجاب) یش هەر بە پاکی و پیرۆزی دەمێنێتەوە، هەروەکو خوای گەورە (جل جلاله) دەفەرموێت: (يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّا أَنْفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ) (البقرة: ٩).

واتە: ئەو جۆرە کەسانە، دەیانەوێ فێڵ لە خوداو باوەڕداران بکەن، بەڵام ئەوانە تەنها فێڵ لە خۆیان دەکەن و کەس لە خشتە نابەن تەنها خۆیان نەبێت، کەچی هەست ناکەن. خاڵێکی گرنگتر، دیارە خۆی لەخۆیدا (حیجاب) پیرۆزەو خەڵکی بە چاوی پڕ لە ڕێزەوە سەیری دەکەن، بۆیە ئەو ناپاکانە پەنای بۆ دەبەن، بۆ ئەوەی بتوانن لەم ڕێگایەوە ڕێزو خۆشەویستی خەڵك وەدەست بێنن، نەتانبیستووە! کاتێك یەکێك تاوانبار دەکرێت بە تاوانێك، بۆ بەرگری لە خۆکردن و خۆ رزگارکردن دەڵێ: کوڕە من خزمی فلان کەسم، ئەگەر (فلان کەس) ناسراو و پایەداربێت؟!

## پاساوی دوانزەهەم:

هەندێکی تر لە خوشکان پاساو بۆ ئەوە دەهێننەوە، کە خۆداپۆشین بەندیان دەکات و ناتوانن بە سەربەستی سەردانی خزم و ناسیاوانیان بکەن و، هاوڕێیەکانیان وایان لێ دەکەن

هەست بە شەرمەزاری بکەن! ؟ خوشکی بەڕێزم، چ پێویست بە شەرمەزاری دەکات؟ ئایا گەڕانەوە بۆ راستی و جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورە باشتر نیە لە ژیانی گومڕایی و یاخی بوون لە خوای میهرەبان؟ خۆ ئەگەر بهاتایە (حیجاب) جۆرێك بوایە لە مۆدێلی جل و بەرگ، ئەوا بە هیچ جۆرێك هەستت بە شەرمەزاری نەدەکرد و، لات شتێکی ئاسایی دەبوو! کەچی هەمان پۆشاك، ئەگەر بە فەرمانی خودا بێت، هەست بە شەرمەزاری دەکەیت! ؟ کە رەزامەندی خوای گەورەی پێ وەدەست دەهێنن؟ ئایا بانگەوازی مۆدێل پەرستەکانت لا گەورەترە لەبانگەوازی خوای گەورە؟ خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ) (الأحزاب: ٣٦)، واتە: هیچ باوەڕدارێك (پیاوبێ یان ئافرەت) بۆی نیە راوبۆچوونی هەبێت لەبەرامبەر هیچ یەك لە فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڵکو دەبێ ملکەچ بێ بۆ هەر فەرمانێك، کە لەلایەن خواو پێغەمبەرەکەیەوە (صلى الله عليه وسلم) بێت. خوشکی بەڕێز، بۆ هەست بە شەرمەزاری دەکەیت لەکاتێکدا دەزانیت کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕووت تێ دەکات و لێی تێ دەگەیت؟ بەڵکو دەبێت وەڵامی ئەم ئایەتە بدەیتەوە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ) (الأنفال: ٢٤)، وە ئەوانەی تۆ گرنگی بە قسەکانیان دەدەیت دوو جۆرن: جۆرێکیان، برِوادارن وەك تۆ و بەچاوی رێزەوە سەیرت دەکەن و

لێت حاڵی دەبن، بەوەی کەسێکی خاوەن باوەڕیت و بەدەم بانگەوازی خوای گەورەدا چوویت و کەسایەتی خۆت پاراستووە و زیاتر واقیع بینانە، مامەڵەت لەگەڵدا دەکەن. جۆرەکەی تریان، کەسانێکن، نا دانا، فێڵ باز، دوو ڕوو، هیچ پێویست ناکات قسەکانیان بەو گرنگی یە وەرگریت، بەڵکو دەبێت تۆ ئەوان بە هەڵە بزانیت و داوای ئەوەیان لێ بکەیت کە بێنە ریزی تۆ و بەوپەڕی باوەڕ بەخۆبوون و سووربوون لەسەر کرداری ڕاستت، وەك چیایەکی نەلەرز بەرامبەریان بوەستە، هەرچەندە بە دواکەوتوو و کۆنەپەرستیش ناوت بەرن، چونکە دەبێت ئیماندار بەهێز بێت لەبەرامبەر هێزی شەپۆڵی خوانەناسان و، تۆش خوات لەگەڵ دایە.

## پاساوی سیانزەهەم:

هەندێ لە کچانی دونیا خواز، وا حاڵی بوونە ئەگەر جوانی لەش و لاریان وەدەربخەن، ئەوا سەرنجی گەنجان رادەکێشن و، زوو داخوازییان دێت! بەواتایەکی تر هەروەك چۆن بازرگان کالأیەکانی خۆی پیشانی کڕیار دەدات. خوشکی هۆشمەند، هەر گەنجێك بەو شێوەیە تۆی بووێت، ئەوا لە تۆ حاڵی نەبووە کە چ رۆڵێکت هەیە لە بنیاتنانی خێزان و کۆمەڵ، بەڵکو بەدوای جوانیەکەتدا دەگەڕێت، بۆیە هەرکاتێك ئەو جوانیەی تۆی لەبەرچاو کەوت ئەوا بەدوای یەکێکی تردا دەگەڕێت و،

گەورەترین ستەمت لیّ دەکات و، تەنها بیر لەو شتانە دەکاتەوە کە ئەو پێیانەوە بەختەوەر دەبێت بە تێگەیشتنی خۆی، جا ئەو جۆرە پیاوەت بۆ چیە؟ پیاوێك هەڵبژێرە کە خاوەن ئیمان و لەخوا ترس بێت، کە تۆی خۆش بوێت، وە بەهۆی پەیوەست بوونت بە فەرمانەکانی خودا، رێزت لیّ دەگرێت، ئەگەر خوانەخواستە ناکۆکیش کەوتە ناو خێزان ئەوا ستەمت لیّ ناکات و مافی تەواوت پیّ دەدات، جا کەواتە هەر یەکەو لەئاستی خورەوشتی خۆی هاوسەر بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت و، تۆش یەکێك هەڵبژێرە کەلە خواترس بێت چونکە یەکەم حاڵەت کەبەسەر (ادم و حەوا) داهات (علیهما السلام) پاش دەرچوونیان لە بەهەشت بەرگ لەبەر داماڵێن بوو، کە خوا (جل جلالە) دەفەرموێت: (یابنی آدم لا یفتننکم الشیطان کما أخرج أبویکم من الجنة ینزع عنهما لیباسهما لیریهما سواتهما)، واتە: ئەی نەوەی ئادەم، شەیتان لە خشتەتان نەبات هەروەك دایك و باوکی ئێوەی لەبەهەشت وەدەر ناو، جل و بەرگیان لەبەردا داماڵین بۆ ئەوەی لەش و لاریان وەدەر بکەوێت کەواتە بەدەرخستنی جوانی لەش، داوا و مەرامێکی شەیتانە لە ئافرەتان، ئایا تۆ رازیت بەوەی کە داوای شەیتان جیّ بەجیّ بکەیت؟ وەیان هەندێك لە خوشکان، سەرپۆشێك دەخەنە سەریانەوە قژیان دیارە، گوایە خۆیان داپۆشیوە! وە لە لایەکی ترەوە سینگیان رووتە و میکیاجێکی تەواویان کردووە و بە کوچەو کۆڵاندا پیاسە دەکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی زیاتر

سەرنج ڕاکێشانی پیاوان، چونکە شتێکی نالەبار دەبینن و لێ ی وورد دەبنەوە، یان بەو جۆرە کارەی، دەیەوێت (ناشرینی) خۆی بشارێتەوە! ئەوەی ڕاستەو زانراوە، جوانی شتێکی ڕێژەییە (نسبیە)، هەروەکو دەشزانین کە جوانی ڕەوشت، لەسەرووی گشت جوانیەکانە، بەتایبەتی بۆ ئافرەتان. گریمان ئەگەر هیچ دەقێکی قورئانیش نەبوایە دەربارەی خۆداپۆشینی ئافرەت، ئەوا دەبوایە ئافرەتان، هەر خۆیان لەخۆیانەوە وەك دەست پێشخەریەك خۆیان داپۆشیبایە، بۆ پاراستنی ئەو ڕێزەی کە پێیان دراوە، هەروەها بۆ خۆپاراستن لە پەلامارەکانی دڕندەکان. نەك ئافرەت بکرێت بەهۆکارێك بۆ بەهەرمێن کردنی شتێکی ماددی، وەك ئەوەی لە ولأتان، پڕوپاگەندە بۆ میوانخانە و چێشتخانەو تایەی ئۆتۆمبێل دەکرێت و، ئافرەت دەکەن بە هێمای باشی و پوختەیی کالأکانیان!!

## پاساوی چواردەهەم:

هەندێك لە خوشکان دەڵێن: (حیجاب) گرنگ نیە! نعوذبالله: گرنگ ئەوەیە مرۆڤ (دڵی) پاك بێت! لەوانەیە ئەگەر (حیجاب) بپۆشین لە کارەکانمان دەربکرێین، یان وەك تاوانبارێك سەیر بکرێین!! ئەم جۆرە پاساوانە، یەکێك دەیانهێنێتەوە کەلە بنەڕەتدا، کەم و کورتی هەبێت لە جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی وەك نوێژ، ڕۆژوو ... هتد ئەگینا ئەبێ ئەمە چ جۆرە دڵێك بێت؟! باوەڕی بە دروستی ئەرکەکانی هەبێت بە (دڵ) کەچی

بەکردار جیّ بەجیّیان ناکات ، خوشکی بەریّز، باش بزانە کە ئاینی ئیسلام هەمووی بەیەکەوە بەستراوەتەوە، جیاناکریّتەوە، هەر لە باوەڕهیّنان بە دلّ و وتنی بە زمان و جیّ بەجیّ کردنی بە کردار، هەرکاتیّك یەکیّك لەمانە لەوانیتر دابڕا ، ئەوا زریزەکە دەپچڕیّت و کاری تەواوی خۆی پیّ ئەنجام نادریّ، لەوەش زیاتر پیّغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی: (انما الاعمال بالنیات وانما لکل امرئ مانوی)، ئیسلام کردەوەیە، دلّی چاك کردنەوەی چاکی لەگەلّ دادەبیّت، چونکە دلّ، خالّی سەرەکی سەرهەلّدانی هەموو چاکەو خراپەیەکە، چونکە نیەتی چاك بەتەنها، مرۆڤ رزگار ناکات، نەلە دونیاو نەلە دوارۆژدا، ئەگەر کردەوەکە بەگوێرەی نیەتەکە ئەنجام نەدات. أبو بکر –خوا لیّ ی رازی بیّت– لە کاتی هەلّگەڕانەوەی کۆمەلّیّك لە موسولّمانان و یاخی بوونیان لە زەکاتدان دا هەلّویّستی چۆن بوو؟ جەنگی لەگەلّدا کردن، لیّرەدا ئەمە ئەوە دەگەیەنیّ کە ئەنجام نەدانی ئەرکیّك لە ئەرکەکان، مانای یاخی بوون دەگەیەنیّ , (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ) (الصف: ٢) خالّیّکی تر، ئیّمەی موسولّمان دەبیّ باوەڕیّکی تەواومان هەبیّ کە رزق و رۆزی تەنها بەدەست خودایە، نەك بەدەست ئەم و ئەو لە مرۆڤانی وەك خۆمان، هەروەك پیّغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) دەفەرمویّت:

((ان احدکم یجمع خلقه في بطن امه اربعين یوما ثم یکون علقة مثل ذلك ثم یکون مضغة مثل ذلك ثم یبعث الله ملکا فیؤمر باربع کلمات ویقال له اکتب عمله ورزقه واجله وشقي او سعید ثم ینفخ

فيه الروح، فان الرجل منكم ليعمل حتى ما يكون بينه وبين الجنة الا ذراع فيسبق عليه كتابه فيعمل بعمل اهل النار، ويعمل حتى ما يكون بينه وبين النار الا ذراع فيسبق عليه كتابه فيعمل بعمل اهل الجنة)) (أخرجه البخاري).

واته: لەم فەرموودەیەدا، وا دەردەکەوێت، کە کۆرپەلە هێشتا هەر لەناو رەحمی دایکیەتی، خوای میهرەبان رزق و رۆزی بۆ دیاریکردوە، جا کەم یان زۆر ..... وە خواش دەفەرموێت: (وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ) (الذاريات: ٢٢)، دەبێ ئەمەش رەچاو بکەین کە دەبێ کارێك بکەین رەزامەندی خودای تێدابێت، موچەیەك وەیان بژێویێك لە یاخی بووندا وەدەستی بێنم، دەبێ چ خێرو بەرەکەتێکی هەبێت؟! تا لە برینی بترسم؟! بەڵکو خواپەرستن، دوعا کردنی بەردەوام، کارکردن بە هۆکارەکان، هەموو ئەمانە دەبنە هۆی زیادبوونی رزق و رۆزی. چونکە خوای گەورە بەڵێنی داوە، کە دەفەرموێت: (وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا (٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ) (الطلاق: ٢) هەر کەسێك پارێزکاری بکات، خوا دەرگای رزگاری لێ دەکاتەوە و بەشێوەیەك رزقی دەدات کە هەرگیز بیری لەو شێوە وەدەست کەوتنە نە کردبێتەوە. لە هەموو شتێکیش زانراوتر ئەوەیە کە (نەفەقە) ی خۆت و منداڵەکانت لەسەر تۆ نیە. ئیسلام نەفەقەی تۆو و منداڵەکانی لەسەر گەورەی خێزان واجب کردوە.

## پاساوی پانزدەهەم:

هەنـدێك دەڵـێن: ئێمـە دڵنیـانین لـەبوونی هـیچ بەڵگەیـەکی ڕاستەوخۆ لە قورئاندا، کە فـەرمان بـە (حیجـاب) بکـات، ئەگـەر هـەبێتیش تایبەتـە بـە خێزانـەکانی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسلم) . شتێکی ئاشکرایە دوژمنان و ناحەزان، هەر لەسـەرەتای سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام، دەستیان کردوە بە پیلان گێـران بـۆ لـەناو بردنـی ئـەم ئاینـە، وەیـان هـەر نـەبێت ناشـرینی بکـەن و بتوانن موسـوڵمانانی لێ وەدوورکـەن، بـە جۆرەهـا شـێوەو نـاو و ناتۆر کە گوایـە لەگـەڵ شـیرازەی پێـشکەوتن و ئـەم سـەردەمە ناگونجێـت و، ئـەم پاسـاوە دێننـەوە، کـە دەڵـێن فـەرمان بـە (حیجـاب) نـەکراوە بـۆ تێکڕایـی ئافرەتـان، بـەڵکو تایبەتـە بـە دایکانی ئیمانداران، واتە خێزانەکانی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسلم).

ئەو خوشکانە، دەبێت باش لە قورئان حاڵی بن و وابـزانن کـە حیجـاب یەکێکـە لــە فەرمانــە گرنگــەکانی خــوای گــەورە و پێغەمبــەریش (صــلی الله علیــە وســلم) زۆر بــە ئاشــکرا لــە فەرموودەکانی دا جەختی لەسەر دەکاتـەوە . وە گریمـان (پـەنا بـەخوا) هـیچ بەڵگەیـەکی قورئانیمـان بەدەسـتەوە نـەبوو بـۆ خۆداپۆشین، ئەوا دەبێ ئافرەت خۆی لەخۆیدا بەم کارە هەڵسێ و بالاپۆش بپۆشێ بۆ پاراستنی ئەو ڕێـز و پایـە گرنگـەی پـێ ی دراوە، هەروەها ئەگەر سـوودەکانی (حیجـاب) لەبەرچـاو بگـرین

ئـەوا پێویـست بـەوە ناكـات بـە شـوێن بەڵگـەو شـتی شـەرعیدا بگـەڕێین، لەگـەڵ ئەوەشـدا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: (وَقُـلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُـضْنَ مِـنْ أَبْـصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْـنَ فُـرُوجَهُنَّ وَلَـا يُبْـدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْـدِينَ زِينَتَهُنَّ) (النـور: ٣١) واتـە: هـەروەها فـەرمان بكـە بـە ئـافرەتی باوەڕدار كە چاویان بپارێزن لە (نەزەر) و دامێنی خۆیان بپارێزن لـەكاری نـاڕەوا، هـەروەك فـەرمان بـە پیـاوانی بـاوەڕدار كـراوە، ئەوەی شایەنی لێ ووردبوونەوەیە، ئەوەیە كـە ئـافرەتی بـاوەرار فەرمانێكی تریـشیان پـێ كـراوە جگەلـەوەی كـە ئاماژەمـان پـێ كرد، ئەویش، وەدیارنەخستنی جوانیانە، تەنها ئەوە نـەبێت كـە ناشاردرێتەوە (زۆربەی زانایان رێكـن لەسـەر ئـەوەی كـە (الا مـا ظهـر منهـا)، دەم و چـاو و دەسـتەكان تـا مەچـەك دەگرێتـەوە.

هــەروەها ئافرەتــانی بــاوەڕدار دەبــێ (خمــار) بــەكاربێنن بــۆ داپۆشینی گەردەن و سنگیان لە كاتی بوونی كەسی بێگانە ، وە جوانی خۆیان بەدیارنەخـەن. عائیـشەخان رەزای خـوای لێ بێـت دەڵێت (رَحِمَ الله نساء المهاجراتِ الأُول، لمّـا أنـزل الله (وَلْيَـضرِبنَ بخمرهنَّ علـى جيـوبهن) شَـقَقنَ مـروطَهنَّ فَـاختَمَرنَ بِهـا) بوخـاری گێڕاویەتیەوە (٤٧٥٨)، هەروەكو عائیـشە خـان رەزای خـوای لێ بێت دەڵێت: رەحمەتی خوا لە یەكەمـەكانی ئافرەتـانی كۆچـكار بێت، هەر كە گوێیان لەم ئایەتەبوو دەست بـەجێ، جـێ بـەجێ یـان كـرد. هـەروەكو لـە شـوێنێكی تـردا خـوای گـەورە زۆر بـە ئاشكرا دەفەرموێت (يَـا أَيُّهَـا النَّبِـيُّ قُـلْ لِأَزْوَاجِـكَ وَبَنَاتِـكَ وَنِـسَاءِ

الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) (الأحزاب: ٥٩) هەروەکو لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا هاتووە لە ریوایەتی بوخاری و مسلم ,دەگێرنەوە، رۆژێکیان عمری کوری خەتاب (خوا لێی رازی بێت) داوای لە پێغەمبەر کرد (صلی الله علیە وسلم) کە فەرمان بدات بە خێزانەکانی، کە خۆیان داپۆشن، ئینجا ئایەتی (حیجاب) دابەزی. یان بەشێوەیەکی تر هاتووە، کە جارێکیان ئیمامی عمری کوری خەتاب (خوالێی رازی بێت)، داوا لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات کە شتێکی وابکات و فەرمان بکات بە خێزانەکانی حیجاب بپۆشن، ئینجا ئایەتی (حیجاب) دابەزی. هەرچۆنێك بێت، بەڵگەکان وا دەگەیەنن کە خۆداپۆشین گشت ئافرەتەکان دەگرێتەوە و تایبەت نی یە، تەنها بە دایکانی ئیمانداران (خوا لێیان رازی بێت)، ئەوەی شایەنی وەبیرهێنانەوەیە ئەوەیە کە پەندو ئامۆژگاری لە ئایەتە گشتیەکە وەردەگرێت نەك لە هۆیەکی تایبەت بەڕووداو، خۆ ئەگەر واش بێت، (تایبەت بێت بە دایکانی ئیمانداران)، ئەوا ئێمەو توێژی ئافرەتان دەبێ ئەو دایکانەمان بکەین بە پێشەنگی خۆمان و چاویان لێ بکەین، کە هەموو ژیان و رەفتار و گوفتاریان هەر خێرو چاکە بووە، نەك ئافرەتانی رۆژئاوا بکەین بە پێشەنگ، کە هیچ پێوەرێکی رەوشت و داوێن پاکی و ئەو رۆڵەی کە خۆیان پێیەوە تایبەتن لایان نەماوەو بوونەتە ئامێرێکی ماددەو، دامرکانەوەی حەزو و ئارەزووەکان.

## پاساوی شانزەهەم:

هەندێ لە ئافرەتان دەڵێن: (حیجاب)، ڕێگا لە جوڵانەوە و هەڵسوکەوت و پێشکەوتن و داهێنان دەگرێت! وادیارە ئەو خوشکانە وای بۆ چوون کە پێشکەوتن و شت داهێنان، بە بەدەرخستنی جوانی ئافرەت و تێکەڵ بوونیان لەگەڵ پیاواندا لە شوێنە جیاجیاکاندا، دێتە کایەوە! وە هۆی پێشنەکەوتنی تەکنەلۆژیاو شارستانیەت, (حیجاب)ە. گوایە حیجاب ڕێگەیان پێ نادات فڕۆکەو ئۆتۆمبێل دروست بکەن! باشە ئەگەر وایە! خۆ زۆربەی وڵاتانی بەناو ئیسلامی، سەرپۆش و خۆداپۆشینیان واز لێ هێناوە و خستویانەتە ژێر پێ و، ئافرەتەکانیان هاتوونەتە ناو جەرگەی مەیدانی پیاوان و لە شەقام و کارگەو فەرمانگەکان، کەچی هیچ کام لەو وڵاتانە پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە نەبینیوە! وەیان ئایا؟ بە تێکەڵ بوونی قوتابیان و فەرمانبەران توانیویانە شارستانیەت بەرەو پێش ببەن و، توانیویانە بە سەر و سینەی روتیانەوە کیشەکانی ئابووری و کۆمەلآیەتی و، خوێندن و رەوشت، کۆتایی پێ بێنن؟ بێگومان دەڵێن: نەخێر. کەواتە بۆچی ئەو کەسانەی داوای شارستانیەت و پیشکەوتن دەکەن، هۆی دواکەوتنیان دەدەنە پاڵ جل و بەرگی حیشمەت و؟ هەموو هۆکارەکانیان دەدەنە پاڵ؟! ئایا شارستانیەت چ پەیوەندییەکی بە رووتی ئافرەت و رابواردنی ئاژەڵیانە و ئارەزوو دامرکاندنی ژن و پیاوەوە هەیە؟ ئایا لە مەرجەکانی

پێشکەوتندا هاتووە کە دەبێ ئافرەت جەستەیەکی بێ گیان و بێ ئابڕوی هەبێت؟

## پاساوی حەڤدەم:

دەستەیەکی تر لە ئافرەتان دەڵێن: (حیجاب) بۆ سەردەمێك هاتووە و ماوەکەی بەسەرچووە، (سبحان الله)! بۆیە ئەگەر بیپۆشم ئەوا پێم دەڵێن، هەی کۆنەپەرست و تێنەگەیشتوو، بۆ تام و چێژ لە جوانیەکەت وەرناگریت؟ دوایی هەرکاتێك ویستت (تەوبە) بکەیت ئەوا خوا لێت خۆش دەبێ و دەرگای (تەوبە)ش کراوەیە و هەمیشە لەسەر پشتە!؟ بەڵێ، لەگەڵتداین لەوەی کە دەرگای (تەوبە) کراوەیە، بەلاّم لەهەمان کاتدا، خوای گەورە ئاگادارە بەهەموو شتێکی بچووك و گەورەو ئەوانەی بە دڵیشدا دێن. بۆیە بەهیچ شێوەیەك فێڵی لێ ناکرێت (يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ) (غافر: ١٩). واتە: خوای گەورە ئاگادارە بە هەموو جوڵەیەکی چاو با لەژێر پەردەشەوە بێت، هەروەها ئاگاداری ئەوەشە کەلەناو دڵەکاندا پەنهانتان داوە، جا هەر ڕێبازێك بێت. ئەو جۆرە کەسانە پێچەوانەی ڕاستیەکان بیر دەکەنەوە، چونکە بڕیارەکانی خوای کار بەجێ زۆر ڕوون و ئاشکران و، هیچ کەسێك بۆی دەستکاری ئەو شتانە بکات کە پەیوەندییان بە (حیجاب)ەوە هەیە یان ماوەیەکی دیاری کراوی بۆ دەست نیشان بکات بەپێ ی حەزو و ئارەزووەکانی، بەڵکو

ئەمانــە گــشتی فێــڵ و پیلانــەکانی شــەیتانن، ئــەم جــۆرە بیرکردنەوەیــە بــە دڵــی ئــادەمیزاد دا دێنێــت هــەر لــەو ڕۆژەی شەیتان لە ڕەحمـەتی خـودا دەرکـرا و نـەفرەتی لێ کـرا، هـەوڵی داوە و هــەوڵ دەدات کـارێکی وا بکـات پۆشـاکی ڕێـز و ڕەوشـت بەرزی بەژن فڕێ بدات و لـە خـواو پێغەمبـەری خـودا (صلی الله علیه وسلم) یاخی بکات، بەمـەش ئـافرەتێکی دڵ ڕەق و ویـژدان مـردووی لێ دروسـت دەبێـت بەرامبـەر بـە پەیامـە پیرۆزەکـەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم). لەراستی دا بالاپۆشـی و جـل و بەرگی ڕێك (شـەرعی)،دیمەنێکـە لـە دیمەنـەکانی شارسـتانیەت، ڕووتــی و بــەڕەلایی ئــافرەت بێگومــان گەڕانەوەیــە بــۆ ژیــانی ئاژەڵی. ئەوەی راسـتەو زانـراوە کەبـە نـرخترین شـتێك ئـافرەت هەیـەتی و پــێ ی ناسـراوە ئـابڕۆ و پـاکی و ڕەوشـت بەرزیـەتی، کەواتــە (حیجــاب) خــاڵێکی گرنگــە بــۆ پاراســتی ڕەوشـــت و کەسایەتی و مرۆیـی ئـافرەت، وەنـە لـە بەرژەوەنـدی ئـافرەت و نەلە بەرژەوەنـدی کۆمـەڵ دایـە، کـە ئـافرەت بـێ پۆشـاك بێـت، بــەڵکو دەبــێ ببێتــە فاکتــەرێکی کاریگــەر بــۆ کــاری چــاکە و پەروەردەکردنی کۆمەڵ. وە بۆ ئەوەی زیـاتر بـۆ ئـەو خوشـکانە ڕوونــی کەینــەوە کــە (حیجــاب) پارمــەتی ئــافرەت دەدات لــە جوڵانــەوەو هاتوچــۆدا، بەپێــچەوانەی ئــەو ئافرەتانــەی کــە سفوورن، هەروەکو بینیومانە، کەچۆن ئەو ئافەتانەی کە بـەرگی بێ (شەرعی)یان پۆشیوە دووچاری شەرمەزاری و نالـەباری دێـن کاتێك دەیانەوێ لەشوێنێك دابنیشن کە پیاوی لێ بێت! ناچار،

یان بەدەستیان، یان بە جانتاکەی دەستیانەوە بەشێك لە لەشی خۆیان دادەپۆشن و رەنگیان تێك دەچێت و هەست بە تاوانباری دەکەن و نازانێت چۆن خۆی لە چاوی چاو تێ بڕەکان رزگار بکات، ئایا ئەمە بەڵگەیەکی بەرچاو نیە کە (حیجاب)، ئەو بەرگە تایبەتیەیە کە بۆ ئافرەت دیاری کراوە؟ خوشکی بەرێز و ژیر، دوای لێ ووردبوونەوە لەم راستیانە، وەرەوە هۆش خۆت و بەرگی رێز و پایەبەرزی بپۆشە و خۆراگربە لە بەرامبەر زمان و تانەی ناحەزان، کاروانیش هەر بەرێوەیە ... جا ئەوەی لێت داوا دەکرێت ئەوەیە، کە ئەو جۆرە قسەو پڕوپاگەندانە لە ڕاستە رێگاکەی ئیسلام لات نەدەن و شوێن شەیتان نەکەوێت، سزای خوای گەورە بۆخۆت ڕەوانەکەیت و، خۆت بپارێزە لە توڕەبوون و سزای خوای گەورە، چونکە جەستەی ناسکی ئافرەت ,بگرە پیاوانیش, توانای خۆڕاگری نیە لە بەرامبەر ئێش و ئازارەکانی دۆزەخ. خوا پەنامان بدات و بمان پارێزێت.

## پاساوی هەژدەم:

کۆمەڵێکی تری ژنان دەڵێن: باوەڕی تەواومان هەیە بە (حیجاب) و فەرمانەکانی تری ئیسلام، بەڵام مێردەکانمان ناچارمان دەکەن کە بەرگی ناشەرعی بپۆشین بۆ رازی کردنیان، ئیسلامیش فەرمانی کردووە بە گوێرایەڵی مێردەکان! ئەو خوشکەو هاوشێوەکانیان وا دەزانن کە ئەو جۆرە پاساوانە بە

هانایان دێت لەبەر دەم دادگایی خوای پەروەردگار، هەروەکو لە بابەتی دایك و باوك باسمان کردووە و جۆری گوێڕایەڵیمان روون کردەوە، ئەگەر گوێڕایەڵی مێردیش، لە دەرچوونی سنووری شەرعدا بێت هەر لەهەمان شێوەدایە. (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (الحجرات : ١) بە چ ڕوویەك،بە چ جورئەتێك بەراورد لە نێوان گوێڕایەڵی خوایەکی بالادەست و مێردێکی بێ باوەڕ دەکەیت؟ بۆ کامیان شایستەی گوێ ڕایەڵین؟ کامیان شایستەی لێ ترسانن؟ خوای دروست کارت، یان مێردەکەت؟! لەوە دەترسیت مێردەکەت دەرت کات و منداڵەکانت لێ بستێنێتەوە؟ لە بەختەوەری ژیانی دونیا بێ بەشت بکات؟ ئایا ئەو شتانە ئەوەندە گرنگن بەلاتەوە ئەگەر بەراوردیان بکەیت لەگەڵ وەدەست هێنانی رەزامەندی خودا و بەهەشتێکی هەتا هەتایی و بەختەوەری دونیا و رۆژیی دوایی؟ هەموو ئەو پرسیارانە دەبێ وات لێ بکەن کە بگەیتە تەنها وەلامێك ئەویش گوێڕایەڵی تەنها بۆ خوای تەنهایەو بەس . خوشکی بەرێز، ئەگەر زۆر دڵت بە هاوسەرەکەتەوەیەو، خۆشت دەوێ، ئەوا دەبێ هێمنانە و ژیرانە کارێکی وا بکەیت کە هەنگاو بە هەنگاو مێردەکەت حاڵی بکەیت و، بەردەوام باسی چۆنیەتی بازاڕ و چاوتێبڕینی گەنجانی بۆ بکەیت کاتێ دەچێتە بازاڕ، ئاگاداری بکەوە لەوەی کە هەندێك لە گەنجان چۆن بێزارت دەکەن و چاو دەبڕنە لەش و لار و جوانیت و پێ ی بڵێ: چۆن رازی دەبیت کە

کەسێکی تر چاو ببڕێتە جوانی من جگە لە تۆ و ئارەزوویان بۆم بجوڵێت؟ دەبێ مێردەکەت لەگەڵ ئەو قسانە (غیرەت)ی جوڵە نەکات؟ لەهەمان کاتدا، هەوڵ بدە لەماڵەوە زیاتر خۆتی بۆ بڕازێنیتەوە و سەرنجی بۆ لای خۆت رابکێشیت و وای لێ بکەیت کە هەموو شتەکان بە گۆڕینەوەی ڕا، چارەسەر دەکرێن تۆ ببیت بە هۆکاری رزگارکردنی هاوسەرەکەت لەو گێژاوەی کە تیایەتی . بەمەش دەتوانیت رەزامەندی خوداو مێردەکەشت وەدەست بێنیت، لە لایەکی ترەوە دەتوانیت پەیوەندی بکەیت بەو خزمانەی کە خاوەن ئیمانن، لە هەردوو لا، بۆ ئەوەی بتوانن هەمان شت بەگوێی هاوسەرەکەت بچرپێنن و لە حەقیقەت حالی ی بکەن. خوای گەورە دەفەرموێت:

(لَا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (المجادلة: ٢٢)

نەخێر، هەرگیز لەناو کۆمەڵی بڕواداراندا کە، (باوەڕی هەبێت بە خوداو رۆژی دوایی)، کەسێك نادۆزێتەوە خۆشەویستایەتی، ئەو کەسانە بکات کەلە سنووری خوداو پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) لایان دابێت، هەرچەندە با باوکیان بن یان کورەکانیان بن، براکانیان یان هۆزەکانیان بن، بەڕاستی ئەو جۆرە بڕوادارانە (ئیمان) لە دڵیاندا چەسپاوە و خواش پاڵپشتی

لێ کردوون، لە ئەنجامی ئەوەشدا دەیانخاتە بەهەشتێك کە رووباری ئاوی سازگار لە ژێریانەوە دەڕوات و هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە و خواش رەزامەندی خۆیانی پێ رادەگەیەنێت و ئەوانیش لێ ی رازین، بەڕاستی هەر ئەوانن (حزب الله) و هەر (حزب الله)ش سەرکەوتوون.[1]

وە ئەگەر زانیت، ئەو هەموو هەوڵ و کۆششانە بێ هودە و بێ ئەنجامن، ئەوا دەبێت بڕیاری خۆت بدەیت و هەڕەشەی دابڕانی لێ بکەیت. چونکە ژیان بەسەر بردن لەگەڵ پیاوێکی وا لە خوا یاخی بوو زۆر گرانە و پڕ لەمەترسی یە.

(الطیبات للطیبین والخبیثات للخبیثین) باش وایە ئەم جۆرە پیاوە، هاوسەرێکی وا بدۆزێتەوە کە هاوشێوە و هاو ئاستی خۆی بێت و، ، ئامانجی سەرەکی تۆش تەنها، رازی کردنی خوای گەورە بێت و، مەبەستت رزگاربوون بێت لە سزای خوای گەورە و، ئازارە جۆر بەجۆرەکانی دۆزەخ، ئەوەش بەوە دەکرێت کە هەموو ئەو رێگایانە بگریتە بەر کە گوێڕایەڵی خوای گەورەی لێ رەنگ بداتەوە ئەو کاتە دەتوانیت بەختەوەری دونیاو رۆژی دوایی بەدەست بهێنیت (انشاء الله). موژدەشت پێ دراوە کە دوارۆژ، تەنها بۆ خۆ داپۆشە، کە جوانترین شێوەی خواپەرستی پێ ئەنجام دەدرێت و باشترین بەرگی پاراستنی رەوشت و ئابڕۆ و گیانی ئافرەتە، هەرچەندە ناحەزانیش دڵ تەنگ و دڵ گران بن.

---

[1] کاتێ دەڵێین (حزب الله) مەبەستمان (حزب الله)ی قورئانیە.

## (( ئامۆژگاری لەچەند خاڵێکدا ))

خوشکی بەڕێزم، ئەم چەند ئامۆژگاری و وەبیرهێنانەوانە ڕەچاو بکە و کاریان پێ بکە، چونکە زۆر پێویستن بۆ دونیا و دوارۆژت:-

١- خۆت لە دەستە خوشك و هاوڕێ ی خراپ و گوناهبار بەدوور بگرە، چونکە هۆکاری یارمەتی دەرن بۆ نزیك بوونەوەت لە گومڕایی و کاری خراپ.

٢- دەبێ زۆرباش بزانیت کە ئافرەت، هەرچەندە لە پلەو پایەی کۆمەڵایەتی و جوانی بێ وێنە دابێت، تەنها ئابڕۆیە بەنرخترین شت.

٣- دەبێ باوەڕت وابێ کە خوای گەورە، ئاگاداری هەموو قسە و کردەوەکانتە لە نهێنیەکان و ئاشکراکاندا.

٤- دەبێ دان بەوە دابنێ ی کە جوانی هیچ کەسێك تا سەر وەك خۆی نامێنێ و، لە سەرجەم کردەوەکانت لێ پرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێت.

٥- ئامانجی تۆ و گشت کەسێك دەبێ تەنها وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت.

٦- دەبێ باوەڕێکی بەهێزت هەبێت کە دوای مردن، یەکەم مەنزڵگا گۆڕە، ئینجا ئەویش، یان مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت، وە یان چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ، ئایا ڕۆژێك

له رۆژان بیرت لەوه کردۆتەوه، که کامیان شیاوی تۆن؟ مێرگەکه یان چاڵه ئاگرینەکه؟

٧- فریو نەخۆیی و هەڵنەخەڵەتێی بە ئافرەتی رۆژئاوا و شوێن کەوتوانیان (ئەوانەی به جارێك خۆیان داماڵیوه له گشت بنەما رەوشتیەکان چونکه ئەوانه ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ الفرقان: ٤٤ واته: ئەوانه وەك ئاژەڵ وان، بەڵکو له ئاژەڵیشیان تێپەڕاندووه، له گومڕایی.

٨- ئەگەر خۆت بەوه دڵنیا ••• •••• کە خوای گەورە، میهرەبان و بەزەییە، ئەوا هەر هەمان خواش له ئاستی ئەو کەسانەی که درێژه به گوناهەکانیان دەدەن دەفەرموێت: وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾ الزمر ٤٧ جا بۆیه نەکەی ئەوەنده خۆت بەوه دڵ ئارام بکەیت که خوا لێت خۆش دەبێت، چونکه له ئەنجامدا وات لێ دێت هیچ فەرمانێکی خوای گەورەت پێ ئەنجام نەدرێت و بەدەستی خاڵی دەچیته ناو گۆڕ.

## مەرجەکانی بالاپۆش ((حیجاب))

١- دەبــێ خۆداپــۆش (حیجــاب)ە کــە، هــەموو جەســتەی (بەدەن)ی ئافرەت داپۆشێت و جل و بەرگەکە بەو شێوەیە بێــت کــە خــوای گــەورە دەســت نیــشانی کــردووە و هەڵبڕینەکەی بۆ نەخشە کێشاویت کەبە جۆرێك جێ بەجێ کردنی ئەم ئایەتــەی تێدا بدرەوشێتەوە کە خوای گەورە دەفــەرموێت: (وَقُــلْ لِلْمُؤْمِنَــات يَغْضُــضْنَ مِــنْ أَبْــصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُـرِهِنَّ عَلَـى جُيُـوبِهِنَّ وَلَـا يُبْـدِينَ زِينَـتَهُنَّ إِلَّـا لِبُعُـولَتِهِنَّ أَوْ آبَـائِهِنَّ أَوْ آبَـاءِ بُعُـولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَـائِهِنَّ أَوْ أَبْنَـاءِ بُعُـولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِـي أَخَـوَاتِهِنَّ أَوْ نِـسَائِهِنَّ أَوْ مَـا مَلَكَـتْ أَيْمَـانُهُنَّ أَوِ التَّـابِعِينَ غَيْـرِ أُولِـي الْإِرْبَـةِ مِـنَ الرِّجَـالِ أَوِ الطِّفْـلِ الَّـذِينَ لَـمْ يَظْهَـرُوا عَلَـى عَـوْرَاتِ النِّـسَاءِ وَلَـا يَـضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُـوا إِلَـى اللَّـهِ جَمِيعًـا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) (النور : ٣١).

هەروەك لە شوێنێکی تردا ئاماژەمان پــێ کـردووە و تەفـسیریش کراوە.

٢- نابێ بالاپۆش (حیجاب)ەکە، ڕازاندرابێتــەوە هــەروەکو خــوای گــەورە فــەرمانی داوە، بــە (ولا يبـدين زينـتهن)، (زينـة)ش، هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە دەبنە مایەی ڕازاندنــەوەی

ئافرەت، هەر لەو جوانیەی کە خوا پیّ ی بەخشیوە و، جل و بەرگ و خشلّ و زێڕ و نەخش و نیگاری سەرپەچە و لاچەك و بەرگ، کە ئەمانە دەبنە مایەی سەرنج راکێشانی خەڵك، ئەوەی ئێستا جاروبار بەرچاو دەکەوێت، ئەوەیە کە هەندێك لە ئافرەتان جل و بەرگ و لاچەکانیان بە دەزووی رەنگاو رەنگ و نیگاری جۆراوجۆر دەرازێننەوە، کە خۆی لە خۆیدا (زینە) یە.

٣- نابیّ بالاّپۆش (حیجاب)ەکە بۆنداربێت، بەتایبەتی لەکاتی دەرچوونی ئافرەت لە ماڵەوەیدا، نابێت بە هیچ شێوەیەك بۆن لە جل و بەرگەکانیەوە بێت، چونکە ئەو کارە دەبێتە مایەی سەرنج ڕاکێشانی خەڵك و چاو تێبڕینیان و هاندانی دڵەکان بۆ بیرکردنەوە و خەیاڵ بردن، بۆ چەند شتێکی ناڕەوا.

٤- دەبیّ بالاّپۆشەکە تێرو تەسەل و فراوان بێت، بەجۆرێکی وابێت کە جەستەکەی هەمووی داپۆشیبێت و قەڵەوی و لاوازی جەستە وون بکات، چونکە هەندێك لە ئافرەتان (حیجاب) دەپۆشن، بەلاّم تەسکە و وێنەی جۆری لەشی (بەدەن)ی دەکێشێت! ئەمەش پێچەوانەی داواکراوەکەیە.

٥- بالاّپۆش (حیجاب)ەکە، نابێت تەنك بێت، بەجۆرێك ڕەنگی پێستی تیا ببینرێت و دیاربکەوێت. جا ئەو جۆرە ئافرەتانەی ئەم جۆرە بالاّپۆشە دەپۆشن با بزانن هەروەکو هیچیان لەبەردا نەبیّ وایە، بەر نەفرەتی (لعنة) خوا و

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکەون.

٦- نابێ ئەو بەرگە (بالأپۆش)ەی ئافرەت دەیپۆشێت لە جل و بەرگی پیاوان بچێت، نەك هەر جل و بەرگ، بگرە، نابێ لە هیچ لە رواڵەتەکانیدا لە پیاو بچێت هەروەکو ئیمامی بوخاری رەحمەتی خوای لێ بێت، کەلە (ابن عباس)ەوە (خوا لێ ی رازی بێت) دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: ((لعن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) المتشبهين من الرجال بالنساء والمتشبهات من نساء بالرجال)) رواه البخاري. واتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی (لعنة)تی لەو پیاوانە کردووە کە خۆیان دەخەنە سەر شێوەی ئافرەت و هەروەها لەو ئافرەتانەش کە خۆیان دەشوبهێنن بە پیاو. چونکە لەوانەیە هەندێك لە ئافرەتان بڵێن، ئێمە خۆمان داپۆشتووە بەلام بەچی؟ بە چاکێت و پانتۆڵی پیاو و، لەوانەشە قژیشی لە قژی پیاو کەمتر بێت! کەواتە مەرجەکانی بالأپۆش (حیجاب)ی تێدا نەهاتۆتەدی.

٧- نابێ جل و بەرگەکە بۆ خۆدەرخستن و ناو بانگ پەیداکردن بێت، بەجۆرێك نازو فیزی پێوەبکات، جا چ پیاو بێت، چ ئافرەت، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (من لبث ثوب الشهرة في الدنيا البسه الله يوم القيامة ثوب مذلة) (أخرجه ابن ماجه) واتە: هەرکەسێك جل و بەرگێك لەبەر بکات بۆ ئەوەی پێ یەوە بەرچاو بێت و نازو فیزی پێ لێبدات، ئەوا خوای گەورە لە رۆژی دوایی دا،

بەرگێکی وەك ئەوی لەبەر دەکات و دوایش گڵپە دەگرێت و گـــڕی لێ هەڵدەســـتێت لـــەناو ئـــاگردا هـــەر وەك لـــەو فەرموودەیـەی سـەرەوە بـاس کـراوە. جـا هـەر دەبـێ ئـەو دوعایە بکەین و بڵێین: خوایە بمان پارێزی لەو جۆرە بەرگـە لـە ژیانمانـدا و لـەو جـۆرە سـزایەش لـە دوارۆژدا. چـونکە کەسانی واهەن، لەو جۆرە جل و بەرگە دەپۆشن، تـەنها بـۆ ئـەوەی خـەڵکی بڵـێن، ئـۆی فلانــە ژن یـا فلانــە پیـاو چ بەرگێکی پۆشیوە ! ؟ بەمەش کارێکی زۆر دەکاتە سەر دڵـی ئـەو کەسـانەی کـە نـاتوانن هـەمان جـل و بـەرگ وەدەسـت بهێنن:

٨-نـابێ ئـەو خۆداپـۆش (جـل و بـەرگ)ەی کـە دەیپۆشـن، چ پیاوانە، چ ژنانە بێت، لە جل و بەرگی خوانـەناس (کـافران) بـــچێت، چـــونکە پێغەمبـــەر (صـــلی الله علیـــه وســـلم) دەفەرموێت: (من تشبه بقوم فهـو مـنهم) واتـە: هەرکەسـێك خـۆی بـشوبهێنێ بـە کۆمـەڵێك، ئـەوا ئـەویش لەوانـە و لـەو کۆمەڵەیــە. جــا ئـــەو خـــۆ شـــوبهاندنە پیـــاوو ئـــافرەت دەگرێتــەوە، لــە گوفتــار و ڕەفتــار، داب و نــەریت، جـل و بەرگ، کەواتــە ئێمـەی موسـوڵمان هـیچ پێویـستیەکمان بـە کەسانی تر نیە نەلە ڕۆژهەلات و نەلە ڕۆژئاوا، چونکە ئێمـە خۆمــان خــاوەن بەرنامەیــەك و شارســتانیەتێکی تێــر و تەســەلین، کــە گــشت بــوار و لایەنــەکانی پێویــستی ژیــان دەگرێتەوە، ئەوەی جێ ی داخ و حەسرەتە، ئەوەیـە کەلـە

ڕۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا، ئـەو لاسـاییکردنەوەیە لـە لایـەن ڕۆڵەکانمانەوە بە (کچ و کوڕ)ەوە، تەشـەنەی کـردووە، لـە جـۆری قژتاشـین و ملوانکـە لـەملکردنی کوڕەکانمـان. بـێ ئـەوەی ڕۆژێـك لـە ڕۆژان، باوانیـان، نـاوەڕۆکی ئـەم فـەرموودەیان بـۆ روون بکەنـەوە یـان ئامۆژگاریـەکی باوانانەیان بکەن، چونکە شتەکە بەو سادەییە نیە! کە باسی لێوە دەکرێت. لێرەدا، ئەوە ڕادەگەیەنم وازهێنـان لـە بەرنامەی خودا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یـاخی بوونە لێ یان و، پەیڕەوکردنی بەرنامەی دوژمنانی ئیسلامە، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە دڵەکانمان بە ئیمان ئـاو بدەینەوە، بۆئـەوەی بکەوێتـە ژێـر باڵی رەحمـەتی خـوای میهرەبـان و، بـۆ ئـەوەی بتـوانین بـەختیاری دونیـاو ڕۆژی دوایـی وەدەسـت بهێـنین و گوفتـار و ڕەفتارمـان ڕێـك بـن لەگەڵ ئەو بەرنامەیەی کە خوا بۆی هەڵبژاردووین و ئێمەش پێی ڕازی بووین و کردوومانە بە ئـایینی ڕەسمـی خۆمـان و ناونیشانی ناسنامە (هویة) کانمان. لـە کۆتاییـدا، لـە خـوای میهرەبان داواکارین کە ئەم هەوڵەمان لێ قەبووڵ بفەرمووێت و بیکات بە پردێك بۆ دەرباز بوونمان لە زەلکاوی نـەفامی و بـێ بـاوەڕی و، بـەرەو بـەختیاری و سـەرفرازی دەسـتمان بگرێت. هەروەها ببێت بە هۆکارێکی کاریگەر بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکان و، لەخوای باڵادەست داواکارین گشت لایـەکمان سەرکەوتوو بکات، هەروەها داواکـارین هانـدەرمان بێـت کـە

تەنها لەژێر فەرمانڕەوایەتی ئەودا کاربکەین و، لەو سنووورە دەرنەچین کە ئەو (جل جلالە) بۆی نەخشە کێشاوین و، خوشك و براکانمان ڕێنمایی بکات و ڕاگیرمان بکات لەسەر ئیمان. وە درووود و سلامی خواش بڕژێت بەسە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)،وە بنەماڵەو یار و هاوەڵەکان و شوێن کەوتوان و، زیندووکەرەوانی سونەتەکانی پێغەمبەری پێشەوامان (صلی الله علیه وسلم). انشاء الله.

# چاپی دووەم

# بەناوی خوای مەزن

## پێشەکی چاپی دووەم

سوپاسێکی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگار، درووود و سەلامی خواش برژێت بۆ سەر پێغەمبەری نازدار (صلی الله علیه وسلم).

دوای تەواو بوونی دانەکانی چاپی یەکەمی ئەم نامیلکەیە، زانیمان کە داوایەکی زۆری لەسەرە، بە جۆرێك لە هەندێ شوێن فۆتۆکۆپی کراوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکە، ناوەڕۆکی ئەم نامیلکەیە (سوپاس بۆ خودا) ڕۆڵی خۆی بینیوە و دیارە خوشکانمان بە پەرۆشن بۆ زانین و تێگەیشتنی ئایینەکەیان. ئێمەش لەسەر پرانسیپی ئەو خاڵانە و چەند مەبەستێکی تر، کە خوازیارین ڕەزامەندی خوای پێ بەدەست بێنین،بڕیارماندا جارێکی تر چاپی بکەینەوە، بەجۆرێك کە (پێش دەستیەکی) بخەینە سەر و، مێژووی سەرهەڵدانی پلانی دوژمن کارانەی دژبە (حیجاب)ی تێدا ڕوون بکەینەوە.

١- ئەم نامیلکەیە زۆر بە دڵسۆزی دەدوێت و پەرۆشی ڕزگارکردنی خوشکانمانە لە خەشمی خوای گەورە.

٢- ئەم نامیلکەیە، داوا لەو خوشکانە دەکات کە سەرقاڵ و هەناسە سوارن بەدوای لاسایی کردنەوەی مۆدێلات، ئەو مۆدێلاتانەی کە کۆمپانیا گومان لێکراوەکان ڕەواجی بۆ دەکەن و، گرنگیەکی لە رادە بەدەری پێ دەدەن، تەنها

مەبەستیشیان وەدەست هێنانی سامان و ئافرەتە.
چونکە لای ئەو کۆمپانیانە ئافرەت هەروەك کالاّیەکی تر، سەیر دەکرێ و مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و بازاڕەکانی پێ خۆش دەکرێت. ئەوە نیە بە جوانی ئافرەت، ریکلام بۆ کالاّکانیان دەکەن؟! ناوەڕۆکی ڕیکلامەکان وادەگەیەنێ: هەر کەسێك سامانی هەبێت، هەم کالاّو، هەم ئافرەت بەدەست دێنێت، لەناو هەر گەلێکیش ئافرەت بوو بە پەرستراو، ئەوا مالّ ئاوایی لەو گەلە بکە. لەم نامیلکەیەدا، دەمانەوێ ژن خۆی لە پلەو پایەکی بەرز بدۆزێتەوە کە شایستە بێت بە بەرزیەتی ژن و بتوانێت ڕۆڵی سەرەکی خۆی بنوێنێت، لە پێگەیاندن و دروست کردنی پیاوانی بەهێزو خاوەن هەڵوێست، چونکە هەر ژنە بێشکەولانەی دروست کردنی پیاوان.

٣- لەم نامیلکەیەدا، داوا لە خوشکانمان دەکەین، کە پۆشاکی حیشمەت و شەرمداری بپۆشن، بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان بپارێزن لە چاوی نەخۆش و ژەهراوی، کە هەمیشە بەدوای ئەوەن کە ئافرەت بکەن بە نێچیر و ژەمێکی دامرکاندنی حەز و ئارەزووەکانیان.

٤- لەم نامیلکەیەدا داوا لە خوشکانمان دەکەین (بالاّپۆش) بپۆشن، بۆئەوەی بتوانن کەسایەتی خۆیان و تایبەتمەندیەکانیان بپارێزن و بتوانن فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەجێ بگەیەنن:

أ- بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی بخاتە ناو قەلاّیەکی پارێزراو

و کەس نەتوانێت دەست درێژی بکاتە سەری و، تاك و کۆمەڵ پارێزراو بێت و پێیەوە گرفتار نەبن.

ب- بۆ ئەوەی ئافرەت بتوانێت لەڕێگای خۆپاراستنەکەیدا نەوەی نوێ دروست بکات.

ئەو بالآپۆشەی (حیجاب) ەی کە ئیسلام داوای پۆشینی دەکات، تەنها هەر بۆ داپۆشینی جەستە نیە! بەڵکو پەیامێکی پیرۆزی باوەڕە و، ناونیشانی ئافرەتی تێدا وەدی دەکرێت.

خوشکی بەرێز: وێڕای سەلام، ئەوپەڕی سەرفرازیت بۆ دەخوازم. ئەم نامەیە بۆ تۆی بەرێزە، بەو هیوایەی بتوانیت ڕەزامەندی خوای بالآدەست وەدەست بێنیت و بکەویتە ناو ژیانێکی پڕ لە خێرو خۆشی هەمیشەیی.لەم نامیلکەیەدا زۆربەی ئەو بیانۆیانەی ڕێگرن لە پۆشینی بالآپۆش، دەست نیشانمان کردوون و،بە چارەسەریەکی گونجاو ولەباری ڕێك لەگەڵ هەستەکان. خوای کاربەجێ دەیەوێت تۆ پارێزراو بیت و دوور بیت لە سوکایەتی پێ کردن، چونکە ئیبلیس و هاوکارانی هەمیشە لە خلیسکاندنتدان و بیانوی خەیاڵیت بۆ دەنێنەوە، تا ببیت بە بووکە شووشەی بەردەستیان و، چۆنیان بوێت بەکارت بێنن بۆ گومڕاکردنی گەنجەکانمان.

خوشکی بەرێز ئاگاداربە نەکەی ببیت بە نێچیری پلانەکانیان و شەیتان بەسەر ئاین و بێ گەردیەکەت زاڵ نەبێت، بە ڕازاندنەوەی پاساوەکان. باش لێ ی ووردبەرەوە، کام ڕێگا هەڵدەبژێریت؟ ڕێگای ڕێنموویی یان ڕێگای سەرگەردانی؟

# ئایا ئافرەت بە خۆ سفوور کردن بەختەوەر دەبێت ؟

بەختەوەری ویستێکی دەروونەکانە، بۆیە دەبینین هەوڵ و کۆششەکان لەگەڕدان بۆ وەدەست هێنانی، هەمووشمان بەدوای بەختەوەریدا دەگەڕێین. با بزانین ئایا، بەختەوەری لە سامان و ژیانی هەبوونی و جوانی و ڕاکردن لە دەست گشت بەها بەرز و یاساکاندایە؟ وە ئایا ئافرەت بەختەوەری خۆی دەدۆزێتەوە لەو کاتەی شوێن کەوتووی حەز و ئارەزوو و شەیتانەکەی دەکەوێت؟ بە پشت گوێ خستنی هەموو ئەو ڕەوشت بەرزی و داب و نەریتانەی کەلە باوك و باپیرانەوە بۆی بەجێ ماوە و، خۆی سفوور کردووە ؟ وە ئەگەر بێت و بەراوردکردنەوەیەکی ویژدانانە بکەین لە نێوان ئافرەتی رۆژئاوایی و، ئافرەتی موسوڵمانی پابەند بە ئاینەکەیەوە، دەبێ کامیان باری گوزەرانی باشتر بێت ولە خۆشی و بەختەوەریدا بژییت؟ هەڵبەتە ئافرەتی موسوڵمان لەوان زیاتر لە خۆشی و بەختەوەریدا دەبێت، ئافرەتی رۆژئاوایی هەمیشە لە دڵەڕاوکێ و نەخۆشیە درێژخایەنەکاندا دەژیت و، شەو خەوی لێ ناکەوێت مەگەر بە بەکارهێنانی حەب و هێمن کەرەوەکان (مهدئات) و مادده بێ هۆش کەرەکان نەبێت! ژیانی، ژیانێکی ماددی تەواوە، هەست بە ئۆقرەو دڵنیایی ناکات، مێردەکەی دۆستێکی (عەشیقە) ی هەیە، دایك و باوك دەستیان لە یەك بەرداوە و،

هەریەکە بۆخۆی لە لایەك دەژیت وئافرەتانیش لە لایەکی تر.
ئەزموونی ئافرەت لەگەڵ پیاواندا، پڕیەتی لە دەردو مەینەتی و تاڵی، هەر هەموویان لە گۆشەی جەستە و چێژ لێ وەرگرتن سەیری ئافرەت دەکەن، ئەو ئافرەتە (ڕۆژئاواییە) هاوەڵایەتی چەندین پیاوی کردووە و لەگەڵ چەندان هاموشۆی هەبووە و لەگەڵ چەندان .... هتد، لەکۆتایشدا، سەرئەنجامی ئەو پەیوەندیانە لێك دابڕان و دووبەرکی لێ ددکەوێتەوە، ئەمە بەر لە هاوسەربوونیان، کەچی ئەوەی دوای ژیانی هاوسەریەتیە، ئەو ئافرەتە لە ژیانێکی پڕ لە دەردەسەریدا دەژیت، ئەگەر شووەکەی پارەی نەما، ئەوا ئەو ژنە واز لە مێردەکەی دێنێت و یەکێکی تر دەکات بە سیسەم نشێنی مێردی پێشووی و، منداڵەکانیشیان بۆ خانەی بێ نەوایان! ! بەگوێرەی ئامارەکانی جیهان، بەکارهێنانی توندو تیژی دژ بە ئافرەتانی رۆژئاوا لە لایەن پیاوانەوە، زۆر، زۆرتر و درندانەترە لەوەی لە نێوان پیاوان و ئافرەتانی موسوڵمان دا هەیە. کچەکانیان، بەدەگمەن دەبینرێت کە گەیشتبێتە تەمەنی (١٤) ساڵی و کچێتی خۆی پاراستبێت و دووگیان (حامل) نەبووبێت، هێشتا هەر لەسەرەتای ناوەندیە! کاتێ منداڵەکەشی دەبێت (ئەمە ئەگەر حەبی (منع الحمل)ی بەکار نەهێنابێ و، لەبەری نەچواندبێت)، لای دایکی جێ ی دێڵێت و بەدوای کوڕە قۆزێکی تردا دەگەڕێت، بۆ ئەوەی منداڵێکی تری ببێت لەو دۆستە تازەیەی ... ئیتر هەر بەم شێوەیە ... ئایا ئەمەیە ئازادی؟ بەڵکو ئەم کارەسات و

ماڵوێرانیه. ئەمە مشتێکه، خۆ هێشتا نەچووینەتە ناو باس و مەرگەساتەکانی (ئایدز) و هەتك کردن و بازرگانی کردن بە ئافرەت، کە بۆتە بازرگانیەتێکی قازانج خەیاڵی، کە چەند کۆمپانیایەکی گەورە و مافیای بەناوبانگی ناسراو بەڕێوەی دەبەن.

## ئایا تۆ جارێ بچووکیت؟
## ئایا بالاپۆش پێوەری ڕەوشتی کەسێك نیە؟

## حیکمەتی بالاپۆش

ئیسلام ئاینی خۆ پاراستنە بەر لەوەی ئایینی چارەسەرکردن بێن، کاتێك بالاپۆش بەسەر ئافرەتدا پێویست دەکات، بۆ پاراستنەیەتی لەو شتانەی کە هیچ حسابی بۆ نەکردووە، بۆ ئەوەی ئافرەت ئازار نەدرێت، دوور بێت لە دەست درێژی پیاوان. هەروەها بۆ ئەوە هاتووە وروژان و فیتنەو شەڕ پێ فرۆشتنیان لەسەر قەدەغە بکات. بێ گومان کاتێك وروژان هەبێت، خۆ وەلامدانەوەشی دەبێ! بە کچێکی زانکۆیم ووت، ئایا ئەو جل و بەرگەی تۆ حەزوو ئارەزووی گەنجان ناوورووژێنێت؟ ئەمە شەڕ پێ فرۆشتن نیە بە هەرزەکاران؟ ئایا ئەو گەنجە هەوڵ نادات بە هەر ڕێگایەك و بەهەر شێوەیەك بێت، لێت نزیك بێتەوە؟ دەفتەرێك؟ مەلزەمەیەك، شتێکی لەو بابەتانەت لێ داوا بکات، تەنها مەبەستیشی نزیك بوونەوەیە لێت، نەك بۆ ئەو زانست و زانیاریەی هەتە، بەڵکو بۆ ئەوەی لە نزیکەوە چێژ لە گەرمایی جەستەو جوانی و جل و بەرگە رازاوەکەت وەربگرێت.

کچەووتی: ئەمەیان سەربەستی خۆمەو، من خۆم بۆخۆم ئەو پۆشاکەی بمەوێ بیپۆشم هەڵی دەبژێرم. واللە دەنا من نوێژ دەکەم و ڕۆژوو دەگرم و قورئان دەخوێنم ..! پێم ووت: خوشکی من، دەمەوێ دیاریەکت پێشکەش بکەم، کە بریتیە لە کتێبێك، تایبەتە بە (بالاپۆشی)، من داوات لێ ناکەم کە (حیجاب–بالاپۆش) بپۆشیت، بەڵکو هیوادارم یەکەم جار دیاریەکەم لێ قەبوڵ بکەیت و، دەمەوێ بزانم دوای خوێندنەوەی، بیرو بۆچوونت، چۆن دەبێ؟ چونکە من دەمەوێ لەسەر بنەمای زانستی و بەڵگەو گۆڕینەوەی ڕاو پێشنیار بونیات نەرەکان گفتوگۆ بکەم، دوای ئەوەی قسەکانمی پەسەند کرد، لەخوای میهرەبان پاڕامەوە ڕێنمویی بکات و چاوەکانی بە نووری ئیمان ڕوون ببێتەوە. لێرەدا دەمەوێ بڵێم: لەوانەیە زۆربەی خوشکانمان لە حوکم و حیکمەتی بالاپۆشی حاڵی نەبووبن بە چەمکە شەرعیەکەی و کەسیش بەپێی پێویست هەوڵی نەدابێ حاڵیان بکەن، ئەگینا زەحمەتە، ئافرەتێك بڵێت: من موسوڵمانم و قورئان دەخوێنمەوە و نوێژ دەکەم و .... بەگوێ ی خواش ناکەم! لەم بوارەدا ..! بروابکەن زۆرترسناکە.وابێنەبەرچاو(تۆلەشاری مەدینەدایتولەکۆڕێك دانیشتویتوپیغەمبەر(صلی اللەعلیەوسلم)ئامادەیەوپێی وتی(کچم خۆت داپۆشە)،دەڵێی: ببوورە لەمەیان بە گوێت ناکەم..؟؟؟؟؟؟؟؟

هەر لێرەدا، دەمەوێ سەرنجی کچانی کورد، ڕابکێشم بۆ

چەند دیمەنێکی ڕۆژئاوا و چۆن ئافرەتی موسوڵمان، خەبات دەکات و تێ دەکۆشێت لە پێناو پاراستنی شەرەف و ناونیشانی پایەبەرزی کە (حیجاب)ە. ئایا هەواڵی خوشکەکانی خۆت بیستووە و چیان پێ کرا لەو کاتەی بە (حیجابەوە) دەچوونە قوتابخانە لە هەریەکە لە (فەرەنسا و ئەڵمانیا)؟ وە ئایا دەنگ و باسی (مەروە قاوقچی)ت بیستووە لە تورکیا؟ وازی هێنا لە ئەندامیەتی پەرلەمان و کورسی ناو پەرلەمان، لەپێناو هێشتنەوەی حیجابەکەی بە بێگەردی؟ ئەوانە بکە بە پیشەنگی خۆت؟ چونکە، لاسایی کردنەوەی ڕێزداران، لە ڕێزداریەوەیە، (مەروە) پەرلەمانی جێ هێشت، چونکە عەلمانیەکان ڕێگەیان پێ نەدا بە حیجابەوە بچێتە ناو پەرلەمانی دەوڵەتێکی عەلمانی!، بەڵام لە ڕۆژی ٩-٢-٢٠٠٨، پەرلەمانی تورکیا بەزۆرینەی دەنگ بڕیارێکیان هەموار کرد بە ڕێگەدان و چوونە ناو قوتابخانەو فەرمانگە حکومیەکان و شوێنە گشتی یەکان بە (حیجابەوە).

دوای ئەو گەشتە خێرایەو دەستنیشان کردنە گونجاوەکان، بۆ گشت پاساوەکان و لێکۆڵینەوەیان ژماردنیان، کە زۆربەی سفوورەکان پەنایان بۆ دەبەن و دەستیان پێوە دەگرن، وە بۆ ئەوەی بگەیتە ڕاستی ی مل کەچ کردنت بۆ فەرمانی خوای گەورە و، خۆت ڕزگارکەیت لەو پاساوە خەیاڵاویانەی کە، خوای کاربەجێ پیشتیوانی کردین لە پوچەڵ کردن و لەکارخستنیان. ئەی ئێستا چ پاساوێکت بە دەست ماوە؟ بۆ ئایا تۆ ڕازیت لە خۆت؟ وە ئایا هەر بەردەوام دەبیت لەسەر ئەو شێوازەی لە

سەری بوویت؟ بۆ زیاتر بیر ناکەیتەوە؟ سەیرێکی خۆت بکە، رۆژ بە رۆژ لە دەرگاکانی گۆڕ نزیك دەبیتەوە. چیت ئامادە کردوە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی فریشتەکانی خوای گەورە؟ بە چ روویەك دەچیتە بەردەم خوای بەرزو بڵند؟ شەرم داتناگرێت ئەو رۆژەی خوای گەورە لێت دەپرسێت؟ ئەی بەندەی من، بۆ گوێڕایەڵیت نەکردم؟ بۆ پەیوەست نەبووی بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانم؟ یان، سێ و دووی لەگەڵ دەکەیت و، دەڵێ ی : خوایە قەناعەتم بەو فەرمانانەت نەبوو! خواش پێت دەڵێ: قەناعەتت بە فەرمانەکانی من نەکرد؟ کە هیچ نابەجێ یەکیان تێدا بەدی ناکرێت نە ئێستاو نەلە دوارۆژ. یان قەناعەتت بە فەرموودەکانی محمدی خۆشەویستی من نیە (صلی الله عیله وسلم)؟ با ئێستا پرسیارێکی ترت لێ بکەم: ئایا خواو پێغەمبەری خوات (صلی الله علیە وسلم) خۆش دەوێت؟ ئەگەر وتت (نا)! خۆ ئەم جۆرە وەڵامە لە بازنەی ئیمان وەدەرت دەنێ (خوا پەنامان دات)، وە ئەگەر ووتت (بەڵێ) خواو پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێت، ئەوا دیسان پرسسیارت لێ دەکات، بەڵگەی خۆشویستنت بۆ خوا و پێغەمبەر چیە؟ خۆ ئاشکرایە، تەنها ڕاگەیاندێکی زارەکی بەس نیە. دەبێ ئەو خۆشەویستیە بسەلمێنیت. چۆن وەڵامی ئەم ئایەتە دەدەیتەوە کە خودا (جل جلاله) دەفەرموێت

اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ) (التوبة: ٢٤)، واتە ئەی

محمد (صلى الله عليه وسلم) پێیان بڵێ: ئەگەر باو و باپیرتان و
رۆڵەو نەوەکانتان و براکانتان و هاوسەرەکانتان و عەشیرەت و
هۆزەکان و ماڵ سامانێکە کە بە دەستان هێناوە، یاخود
بازرگانیەك دەترسن کە شکان و بێ بازاڕی رووی تێبکات و
خانووبەرە و کۆشك و تەلارێك کە حەزدەکەت لێتان تێك نەچێت
و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویست ترو نازدارتر بێت لە خواو
پێغەمبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لەپێناو رێبازی ئەو زاتە،
دە ئەوە چاوەڕوان بن، هەتا خوای گەورە دێت بە
فەرمانەکانیەوە و (تۆڵەتان لێ دەستێنێت) خوای
پەروەردیگاریش هیدایەت و رێنموویی قەومی یاخی و لە سنوور
دەرچوو نادات. تەفسیری ئاسان لاپەڕە (۱۹۰) چاپی هەشتەم.

(۲) (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ
ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (ال عمران : ۳۱)، واتە: ئەی پێغەمبەر
(صلى الله عليه وسلم) بە ئیمانداران بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان
خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن،
ئەو کاتە خواش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناه و
هەڵەکانیشتان خۆ دەبێت، ئەو خوایە لێ خۆش بوو میهرەبانە.
تەفسیری ئاسان لاپەڕە (٥٤) چاپی هەشتەم.

شاعیر دەڵێ: (لو كان حبك صادقا لاطعته أن المحب لمن
يحب مطيع) واتە: ئەگەر خۆشەویستی یەکەت راستگۆ بێت
ئەوا گوێڕایەڵی دەبیت، چونکە خۆشەویست بۆ
خۆشەویستەکەی گوێڕایەڵە.

## (( چرپەی دڵسۆزێك بەگوێی سفوردا ))

خوشکی من: من لەپێناو خوادا تۆم خۆش دەوێت.

خوشکی من: وەبیر خۆت بێنەوە و وای دانێ تۆ لە ئاوزینگ کردن و ساتەکانی مردن دایت و،فریشتەی گیان کێش، ئێستا خەریکە لە پێ یەکانتەوە رووحت دەکێشێت. خوشکۆڵە : وا بینە بەرچاو لەناو کونجی گۆڕەکەت دانیشتووی.

ئەی خوشکە، وەڵامی ئەو دوو فریشتانەت لایە کە لێت دەپرسن لەناو گۆڕدا؟ ئەرێ خوشکێ: کاتی ئەوە نەهاتووە بگەڕێتەوە لای خواو تەوبە بکەیت؟ خوشکە: کاتی ئەوە نەهاتووە بترسێی لە سزای خودا؟ خوشکە (الم يأن للذين آمنوا ان تخشع قلوبهم لذكر الله) ئەم ئایەتە بۆ ئیماندارانە. واتە: کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی ئیمانیان هەیە کە دڵەکانیان مل کەچ بێت بۆ یادکردنەوەی خودا؟ خوشکە من: نەفرەت لە شەیتان بکە، چونکە ئەو رێگرە لە تەوبەکردنت. خوشکی من: هەڵسە لەخەو .......

خوشکی من: خوای پەروەردگار بانگهێشتت دەکات بۆ، بەهەشتێك کە پانی یەکەی هێندەی ئاسمانەکان و زەوی یە. خوشکی من (ئالآی بالآپۆش، حیجاب) بەرزبکەرەوە، چونکە ئەم حیجابە سیمای ئیمانتە، (حیجاب) هێز و ئیمان و پاکی و داوێن پاکیە. خوشکۆڵە: دەبێت کەسێك هەبێت وەڵامم بداتەوە؟

ڕەحمەتی خودا لەو شاعیرەی کە دەڵێ:

**یاخادم الجسم کم تشقی بخدمته**
**اتطلب الریح فیما فیه خسران؟**
**اقبل علی نفس واستکمل فضائلها**
**فانت بالنفس لا بالجسم انسان**

واتە: ئەی خزمەتکاری جەستە چەندە خۆت بە خزمەتکردنیەوە شەکەت دەکەیت ئایا داوای قازانج لە شتێك دەکەیت کە خۆی لە خۆیدا دۆڕاوە؟ ڕوو بکەرە نەفسەکەت و چاکەکانی وەدەست بێنە، چونکە تۆ بە ڕەوشت مرۆڤیت نەك بە جەستە. خوشکی من: ئێستا بەڵێ هەر ئێستا لە ناخی دڵتەوە بڵێ، خوایە گیان، تەوبە بێت گەڕامەوە لات.

## ( دەروازەیەکی کراوە بۆ چەند پرسیارێکی ڕاشکاوانە )

پ: لەوانەیە پرسیارم لێ بکەیت: ئەگەر سفوور (التبرج) ڕواڵەتێکی نامۆیە بەسەر کۆمەڵگاکەمان و حەرامە لە عەقیدەمان، ئەی بۆ لە وڵاتی ئێمە سەری هەڵداوە و بڵاوبۆتەوە؟

وەڵام:

١- لاوازی ئیمان و، نەترسان لە خوای گەورە.

٢- نا دانایی بە حوکمەکانی ئایین، بەتایبەتی ئەو حوکمانەی تایبەتن بە جل و بەرگ لە ئیسلامدا.

٣- لاسایی کردنەوەی کوێرانەو شوێن کەوتنی هەنگاوەکانی شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە.

٤- بڵاوبوونەوەی جل و بەرگی شێوازی خۆرئاوایی، گوناهەکەش دەکەوێتە ئەستۆی ئەوانەی دەیان هێنن.

٥- ڕۆڵی ڕاگەیاندن بە هەردوو لایەنی بینراو و بیستراو و خوێندراوەکان.

٦- لاوازی ڕاگەیاندن و بانگەوازی ئیسلامی.

٧- کەم تەرخەمی پیاو لە گەیاندنی ڕۆڵی پێویست لەناو خێزاندا.

## ( زیانەکانی سفووری )

لە حیکمەتەکانی خوای پاك و بێگەرد، ئەوەیە، هیچ شتێك حەرام ناکات، مەگەر زیانێکی ئاشکرای نەبێت بۆ دین و ژین. سفووریشی حەرام کردووە بۆ ئەوەی کۆمەڵگا و ئادابەکان و رەوشت و بەها بەرزەکان پارێزراو و پاك و بێگەرد بن.

أ- زیانەکانی بەسەر خودی ئافرەتدا:

١- ئافرەتی سفوور هەڵدەقۆزرێتەوە بۆ بەکارهێنانی لە رۆژنامەو فیلم و ریکلامە بازرگانیەکان، بازرگانی پێ دەکرێت بۆ کێش کردنی زۆرترین ژمارە لە کڕیاران.

٢- ئافرەتی سفوور هەردەم دووچاری ئازار و شەڕ پێ فرۆشتن دەبێتەوە لە لایەن خەڵکانی تەڵەکەبازەوە.

٣- سفووری سەرکەشیەك دەدات بە ئافرەت کە، رێگا بەخۆی بدات دەربچێت لە سنوورەکانی ئایین و رەوشت.

٤- سفووری وا دەخوازێت کەلە بەرە بەیانێکی زوو، لەخەو هەڵسێت، بۆ ئەوەی قژ و تیتکی رێك بخات و جل و بەرگی چوونە دەرەوەی شیك بکات و، موکیاج و رەنگی گونجاو لەگەڵ لەگەڵ جل و بەرگەکانی بکات. +ئەمەش کات و ماندووبونێکی زۆری دەوێت و لێ ی بەفیڕۆ دەدات. هەروەها دوا دەکەوێت لە ئەنجامدانی ئەرکە سەرەکیەکانی ناو ماڵ و قوتابخانە.

٥- تووش بوونی ئەندامە رووتەکانی جەستەی بە جۆرەها

نەخۆشی ترسناکی وەك: شێرپەنجە. بەڵگەو راپۆرتی زۆری گۆڤار و راپۆرتی ڕێکخراوەکانی تەندروستی جیهانی لەبەر دەست دان و گەواهی لەسەر دەدەن و ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن.

ب- زیانەکانی بەسەر پیاو:

١- تووش کردنی پیاو، بەتایبەتیش گەنج، بە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە، ئەویش بە سەیرکردن و بەدواداچوونی چاوەکان بە نیگا سەرنج ڕاکێشەرەکەی ئافرەتی سفوور.

٢- هەروەها سفووری وا لەپیاو دەکات، زیاتر گرنگی بە ڕواڵەتی خۆی بدات و زیاد لە پێویست، تا دەگاتە حاڵەتی (نە ژن و نە پیاو) و، دەیگەیەنێتە تۆخمی سێیەم بۆ ئەوەی ئافرەتی سفوور بۆ لای خۆی کێش بکات.

٣- هەروەها سفووری، پلەو پایەو کەرامەتی کەس و کاری ئافرەتە سفوورەکە لەکەدار دەکات(باسی کۆمەلگایەکی بروادارەدەکەین). ئەگەر بێت و، پیاوێك، یان باوکێك، یان برایەك، لەگەڵ هاوسەرەکەی، یان کچەکەی یان خوشکە سفوورەکەی بە شوێنێکدا بڕوات، چی ی گوێ لێ دەبێت و چی دەبیستێ؟! جگەلە قسەی ناشرین و شەڕ پێ فرۆشتن و،سەیرکردنی نەبێت! بەلاَم چۆن سەیرکردنێك؟! وەك بڵێ ی کوڕە شتێکی وون کردبێت و وا گومان ببات کە ئەو کچە سفوورە شتەکەی لەناو چاو و سینەیدا حەشاردابێت!

ج- زیانەکانی بەسەر کۆمەڵگەدا:

١- وڕووژاندنی ئارەزوو و سەرهەڵدانی گیروگرفت لە ئەنجامی بەدواداچوونی جوانی سفوورەکە و شەڕ پێ فرۆشتنی.

٢- کزبوون و سست بوونی توانای سێکسی، ئەویش لەئەنجامی تێربوونی هەریەکە لە پیاو و ژن، بەهۆی زۆر سەیرکردنیان بۆ یەکتر.

٣- نەوازەی سێکسی: واتە سەرهەڵدانی ناوازە، دوای ئەوەی هەریەکە لە ژن و پیاو دەگەنە حاڵەتی تێربوون (الاشباع)، ئەویش هەر بەهۆی سفووریەوە.

٤- سەرهەڵدانی داوێن پیسی (زنا) و نیشانەکانی لەناو کۆمەڵگادا.

٥- لێك هەڵوەشانەوەی شیرازەی خێزان.

٦- وازهێنان لە ژن هێنان، پیاو وای لێ دێت گومان دەبات بەو کچەی کە دەیەوێت بیکات بە هاوسەری خۆی؟ چونکە، وا گومان دەبات و دەڵێ: لەوانەیە ئەمیشیان هەروەك ئەو کچە بێت کە پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبووە!

٧- داڕووخانی ئابووری، ئەمەش بە خەرج کردنی سامانێکی زۆر لە پێناو سفوریدا، لە جل و بەرگی بریقەدار و موکیاج و سەردانی کردنی ساڵۆنەکانی ئارایشتی ئافرەتان، ئەمەش هەمووی پارەی دەوێ.

## پترکراوی چاپی سێیەم

### ((بالآپۆشی ئافرەت))

بـەرێز دکتـۆر (ابـراهیم طـاهر)، چـەمکێکی بۆنـداری پـڕ لـە زانیـاری پـێ بەخـشین دەربـارەی بالآپۆشـی و فـیترەت. کـە بەشـێکە لـەو توێژینـەوەی ئامـادەی کردبـوو، بـۆ وەرگرتنـی بڕوانامەی دکتۆرا لە بـواری پزیـشکی دا، کـە تیایـدا بـە چـەندین سەرچاوەی باوەڕپـێ کراوی پزیشکی و شـەرعی، توێژینەوەکـەی دەوڵەمەند کردبوو. ئێمەش وێڕای سوپاس و پێزانینمـان دەسـت خۆشی لێ دەکەین و خوا پاداشتی بەخێری بداتەوە.

### ((بالآپۆشی لە فیترە و شەرعدا))

یەکەم: کاتێ هێلکۆکەی ئافرەت، موتربە دەکرێت بـە یـەکێك لـە تۆیـەکانی نێرینـە کەلـە لایـەن خـوای زانـا و کاربـەجێ، هەڵدەبـژێردرێت، ئـەو هێلکۆکەیـە بـە پەرۆشـەوە حـەز بـە پێگەیشتنی دەکات و شتێکی کەم هەڵدەڕێژێت لە دیوارەکەیەوە بۆ پێشوازی لێ کردنی، جا ئەو تۆیە دەچێتە ناویـەوە لـە ڕێگـای تـاجێکی ڕەونەقـدارەوە، لـەڕێگای ئـەو دیـوارە ئەسـتوورەی کەبـەهۆی ڕژێنـی (ئەکرۆسـینەوەیە). بـۆ ئـەوەی ناوکـەکانی

بەرامبەر ناوکەکانی تر سەقامگیر بن، لەو کاتەدا هەردوو ناوکەکان، یەك دەگرن بۆ ئەوەی هێلکۆکەیەکی موتربە کراو دروست بکەن – النطفة الامشاج – وە لەدوای ئەوە تاجە ڕەونەقدارەکە لەبەر دادەماڵرێت، دیوارەکە چەند ئەوەندەی تر ئەستوور تر دەبێت، پێشوازی کەرەکان و شوێنە بەیەك نووساوەکان بەسەر دەکاتەوە – Binding sites – بۆ ئەوەی بەرەنگاری ئەو تۆیە زیادانە بێتەوە و، ڕێگا نەدات فرە بە یەککگەیشتنی تر – poly sperm –. ئیتر بە هیچ شێوەیەك ڕێگایان پێ نادات بە هاتنە ژوورەوە، هەرچەندە هەوڵیش بدەن و، وازیان لێ دێنێت بۆ ئەوەی بە ئاهی ساردەوە لەسەر دیوارە ئەستوورەکەدا بمرن.

لەبەرئەوەی هێلکۆکە، وێنەیەکی بچووکراوی ئافرەتە، بۆیە هێلکۆکە، دیوارێکی ئەستووری هەیە و دەورەی دەدات و، بوونەکەی دەپارێزێت لە ژینگەی دەرەوەیدا، جا چ بەر لە گەیشتنی بە تۆی ڕژێنەوە بێت، چ دوای بەیەککگەیشتنی و جووت بوونی لەگەڵ ئەو تۆیە هەڵبژێردراوەیدا، لێرەدا ئەستووری دیواری هێلکۆکە تێرکراوەکە زیاد دەکات، بۆ قەدەغەکردنی هاتنە ژوورەوەی تۆی نێرینەی تر، چونکە بۆتە خاوەن شوو، ئەو هێلکۆکەیە سەرقاڵی دروست کردنی کۆرپەیە، دیوارەکەش دەبێتە پەردەیەکی ماددی و، هەروەها پەردەیەکی مەعنەوی کە خۆی دەدۆزێتەوە لە داوێنپاکی و شەرم و شکۆداریدا. هەروەها خوای پاك و بێگەرد، پەردەی بۆ ئافرەت

دیاری کردووه و، پابەندی کردووه بە جۆرە جل و بەرگێکی تایبەت کە بیپارێزێت لە مەترسیە دەرەکیەکان، وە هەر بەو جل و بەرگ و پەردەیە، ئافرەتی موسوڵمان دەناسرێتەوە، بەو ناوەی کە بانگەوازی خوای جێ بەجێ کردووه  و وەڵامی ئەو فیترەتە خواییەی داوەتەوە بە پۆشینی باڵاپۆش، بەر لە شوو کردن و دوای شوو کردنیشی و، ئەو ئافرەتە بە فیترەیەوە ڕێگا نادات کە یەکێکی بیانی لێ ی وەژوور بکەوێت و، بەیەك گەیشتنی سێکسی لەگەڵ ئەنجام بدات، چونکە خاوەن هاوسەر و ماڵی خۆیەتی و سەرقاڵە بە منداڵەکانی و ڕێکخستنی کاروباری ناو ئەو ماڵەی کە تایبەتە بەخۆی، وە باڵاپۆشی (جل و بەرگی شەرعی ئافرەت) جوانیەك و ڕازاندنەوەیەك  بە ئافرەت دەدات، هەروەها ئەو تاجە درەوشاوەیەی بەسەریەوەیەتی، جوانیەکەی زیاتر دەکات، بەجۆرێك، هیچ جوانیەکی تر نەتوانێت ململانێ ی لەگەڵدا بکات هەرچەندە ئەو ئافرەتە هەوڵیش بدات بە زێڕو گەوهەر خۆی بڕازێنێتەوە، چونکە ئەو جوانیەی یەکەمی جوانیەکی فیتریە. وە دەستگرتن و پارێزی کردن لەو پایە بەرزانە – شەرەف و شەرم و داوێن پاکی– کە بەرزترین و بەهاترین شتێکە کە ئافرەت هەیەتی، لەهەمان کاتدا لەبەرژەوەندی ئافرەت و کۆمەڵگادایە. وەبە هیچ شێوەیەك لە بەرژەوەندی ئافرەت دانیە کە واز لە،خۆداپۆشین و خۆپاراستن بێنێت و، رابکات بەدوای دامرکاندنی حەز و ئارەزووەکانی، بەتایبەتی حەز و ئارەزووی سێکسی، کە کاریگەرترین و

ترسناکترین حەزە، وە ئیسلامیش سنوور و مەرجی داناوە لەبەردەم ئەو ئارەزوویە، ئەویش لەرێگای پۆشاك پۆشیندا، هەر لەبەر ئەمەشە ئیسلام گرنگیەکی تایبەتی داوە بە جل و بەرگی ئافرەت، وە بەشێوەیەکی تێرو تەسەل باسی کردووە، بە چەندین ئایەتی قورئانی و فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

(سيد قطب) ،رەحمەتی خوای لێ بێت, لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: (يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ) (الاعراف : ٢٦)دا دەڵێ: هاوشانیەك و هاوتەریبیەك هەیە لەشەرعی خوادا لە نێوان جل و بەرگ بۆ داپۆشتنی عەورەت و جوانکاری و، پارێزگاریدا (التقوى) دا. هەردووکیان پۆشاکن، ئەمەیان عەورەتی دڵ دادەپۆشێ و دەیرازێنێتەوە و، ئەوی تریشیان (بالآپۆش) عەورەتی جەستە دادەپۆشێ و دەیرازێنێتەوە.

# ( ئارمانجەکانی بالآپۆش )

ئارمانجی ئیسلام له بالآپۆشی ئافرەتدا، وانەبیّ بۆ بە دوورە پەریّزگرتنی ئافرەت بیّ لەژیان، بەڵکو بۆ داپۆشینی جوانیەکەیەتی، لەمەش زیاتر بالآپۆشی ئافرەت لە هۆکارەکانی خۆپاراستنی پیّش وەختەی ئافرەتە دژی هەر گومانیّك کە هەوڵی لەکەدارکردنی شەرەف و ناموسی بدات، وە رۆڵی ئافرەت لە چەرخی سەرهەڵدانی ئیسلام و سەردەمی پەیامی پیّغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو راستیانە دەسەلمیّنن. وە هەروەها لەسەردەمی جیّ نشینەکاندا و دواتریش سەردەمی داڕوخان، باشترین بەڵگەن لەسەر ئەو راستیانە. (زین للناس حب الشهوات)، واتە: خۆشویستن و گەڕان بە دوای حەزوو ئارەزووەکاندا، هەر لە فیترەتەوە بۆ پیاوان و ژنان ڕازاندراوەتەوە، وەك تاقی گردنەوەیەك بۆیان، وە یەکەمین جۆر لە جۆرەکانی ئەو حەزوو ئارەزووانە بەگویّرەی پیاو، ئافرەتە. خوا جل جلالە دەفەرمویّت: (زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ) (ال عمران : ١٤) لە ئوسامە ابن زەیدەوە ئەویش لە پیّغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی: (ما ترکت بعدي فتنة هي اضر علی الرجال من النساء / بخاري) واتە: لەدوای خۆمدا لە هیچ بەلاٌیەك ناترسم

لەوەی لە بەڵای ئافرەتان دەترسم بەسەر پیاوانەوە. ئەگەر هاتوو ئەو دووانە، بەو حەزو و ئارەزووەیانەوە، سەربەستیەکی تەواویان وەرگرت و بێ مەرج و سنوور و ڕێگایاندا بە خۆیاندا بە ئازادیەکی رەها وەگەر بکەون، ئەوا داڕووخان و نزمبوونەوە بۆ ئاستی ئاژەڵی پێشوازییان لێ دەکات. بەڵام خوای کاربەجێ چارەسەری داناوە بۆ تێرکردنی ئەو حەز و ئارەزووانە وەك دانانی چەندین ڕێگای ڕاست و دروست، لەوانە هاوسەرگیری و فرە ژنی و، هاندان بۆ هاوسەرگیری و چەندین یاسای تر کە تایبەتن بە خێزان و پەیوەندی سێکسی شەرعی . وە لەنێو کۆمەڵگادا پاراستنی چاوی داناوە یەکەم جار بۆ پیاو دووەمیش بۆ ئافرەتان. هەروەك رووتی و تێکەڵاوی ناشەرعی حەڕام کردووە لەو حاڵەت و شوێنانەی کە یاسا و سنوورە شەرعیەکانی تێدا رەچاو ناکرێت. وە رێگاشی نەداوە بە چوونە دەرەوەی ئافرەت لە ماڵ، بەبێ کارێکی پێویست، وەك چارەسەریەکی پارێزگاری و رێگە گرتن لە بڵاوبوونەوەی داڕووخانی رەوشتی و گەندەڵی، هەروەك ئاماژەمان کردووە بە زۆربەی مەرجەکانی باڵاپۆشی. خوای گەورە دەفەرموێت

اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ (٣٠) وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ) (النور: ٣١).

سەپاندن و فەرزکردنی باڵاپۆشی بەسەر ئافرەتاندا، لەمیانەی ترس نیە لە ئافرەتانەوە، باڵاپۆشیش مانای وانیە بەهیچ شێوەیەك نیشاندانی کەم دەسەڵاتی و بێ توانایی

ئافرەت بێ، یان کەم کردنەوەی بێ لە پلەو پایەی یان بەکەم زانینی، بەڵکو تەنها بۆ ئەوەیە نەبێتە نێچیری هەڵقۆستنەوە، لە ئەنجامی وڕووژانی پیاو لەبەردەم هۆکارەکانی کێش کردنی ئەو مێ یاتیەی کەلە ئافرەتدا هەیە، دەبێ ئەمەش بزانین کە بالآپۆشی فەرمانێکە لە فەرمانەکانی خوای گەورە و دەبێ ئافرەتی موسوڵمان قەبولّی بکات و پێی رازی بێت بە (سمعنا و أطعنا) وەلآمی بداتەوە، هەروەك بۆ ماوەی چواردە سەدە قەبوولّ کراوە و بێ هیچ نارەزاییەك و بێ بەرزکردنەوەی هیچ سکالآیەك دژبە پیاو، چونکە ئەو بالآپۆشە، پیاو بەسەریدا نەسەپاندووە بەڵکو ئەوەی بەسەریدا سەپاندوویەتی خولقێنەر و خواکەیەتی، لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا) (الاحزاب: ٣٦) ئاینی ئیسلام بە هیچ شێوەیەك قەدەغەی نەکردووە، ئافرەت بە مێ یاتیەکەی خۆی بژیت، بە گشت پێکهاتە هەستی و جەستەیی یەکانیەوە و، نەشی ویستووە دایانمرکێنێت یا بیانخنکێنێت، هەروەك هەندێك لە ناحەزان تەپڵی بۆ لێدەدەن، بەڵکو رێگای پێداوە کەلە ماڵی خۆیدا و بە ژیانی هاوسەرگیری خۆی ژیانی بباتە سەر. ئیسلام بە تێروانینێکی سلبی دەڕوانێتە ئەو ئافرەتانەی خۆی دەکات بە پیاویان خۆی دەشوبهێنێت بە پیاو وەك پیاوەتیەکەی، لەئەنجامدا مێ یاتیەکەی خۆی بۆ هاوسەرەکەی خۆی ناهێڵێت و

ڕەتی دەکاتەوە. هەروەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە کەلە ابن عباس (خوا لێی ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوا دەگێڕێتەوە (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێت: (لعن الله المتشبهین من الرجال بالنساء، والمتشبهات من النساء بالرجال) ئافرەت دەتوانێت و بۆی هەیە ڕواڵەتی مێ یاتی خۆی لە جل و بەرگ و خۆڕازاندنەوە وەدیاربخات لەنێو کۆمەڵی ئافرەتاندا و لەنێو بازنەی ئەو پیاوانەش کە مەحرەمن و بۆ یەك ناشێن. بەڵام ئیسلام دەیەوێت جوڵەی مێ یایەتی ئافرەت ڕێك و پێك بکات لە ژیاندا بە جۆرێك نەگۆڕێت بۆ هۆکارێك ڕەوشتی پیس بکات و[1] لەداوێن پاکیەکەی لابدات، بەگشتی ئیسلام، بۆ حەزو و ئارەزووەکان سیستەمێکی داناوە و نەخشەی پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەتی کێشاوە و سنووری بۆ داناوە، هەروەها چەند ڕێ و شوێنێکی پڕاکتیکی داناوە بۆ دەورەدانی کاری وورووژاندن و کۆنترۆڵکردنی هۆکارەکانی لادان، هەروەك لەمەوبەر ئاماژەمان پێ یان کرد. لەو ساڵانەی دواییدا زانایانی دەروونناسی خاڵێکی زۆر گرنگیان ئاشکرا کرد، دەربارەی خۆ شوبهاندنی ئافرەت بە پیاو، دەرئەنجامەکان دەڵێن: (ئەگەر دایك و باوك، بەردەوتم بوون لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ کچدا، بەهەمان مامەڵەکردنیان لەگەڵ کوڕاندا لە هەموو شتێکدا، لە جل

---

[1] بخاری ۸۰–اللباس– باب ۵۹ الحدیپ ٥٤٦، ۲۲۰۷/* زکریا ابراهیم – سیکولوجیه المرأه. الصفحه ٤٩.

و بەرگ و رواڵەت، یان پەروەردەکردن و بگرە ناولێنانیش، چەند ئاکارێکی دەروونی ترسناکی لێ رەنگ دەداتەوە لە ژیانی داهاتویدا. بەڵێ لە حەقیقەتدا کچی بە کوڕکراو واز لە مێ بایەتی خۆی ناهێنێت، بەڵکو لەو حاڵەتەدا کچ، وەك گۆرانی بێژێکی بچووك دێتە بەر چاو، کە بڵێسەی ململانێ ی کچێتی لێ هەڵدەقولێت، ئەویش بە ئیغراکردنی بەرامبەر بە خۆ سفوورکردن، هەروەها ململانێ ی نێرایەتی لە شێوەی دوژمنکارانە و لەڕوو وەستان. وە کاتێ ئەو پەتایە لەدەروونی کچەدا رەگ دادەکوتێ، لە دوارۆژدا، دەبێتە نێچیری چەندین نەخۆشی و گرێی دەروونی، لەوانەشە جار و بار بەرەو کارو پیشەی داوێن پیسی و لەش فرۆشی هەنگاو بنێت.

## دوا ووتە:

خوشکی بەرێز، دوای ئەوەی توانیمان بە پشتیوانی خوای گەورە، وەلامی ئەو پاساوانە بدەینەوە کەلە ناو کۆمەڵدا باوون و زۆربەی خوشکانمان، خۆیانیان پێ لە خشتە بردووە، جارێکی تر دەمەوێ ئەوە دووبارە بکەمەوە کە ئاینی ئیسلام، پەیام و بەرنامەیەکی تێروتەسەلی ژیانەو گشت بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە و هیچ پاساو و پرسیارێك نیە کە ئیسلام، وەلامی نەدابێتەوە و نەداتەوە، چونکە ئیسلام، ئایین و، بەرنامەی خودایە و، بەرنامە دەست کردەکان لەناو ئەم بەرنامە بەرفراوانە جێ یان نابێتەوە. بۆیە تا کات ماوە، خۆت بگەیەنە بە کاروانی باوەڕداران و پەیرەوکردنی پەیامی بەرزی ئیسلام، چونکە رۆژگار زۆر بە خێرایی تەمەنت دەخوات و رات دەپێچێ و بەرەو مردن و ژیانی ناو گۆڕی پڕ لە ناخۆشی و مەینەت نزیك دەبیتەوە. با لەم کەسانە نەژمێردرێیت کە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: (أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَتْ تِجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ) (البقرة : ١٦) جا با لەو کەسانە نەبین کە گومڕایی و سەرلێ شێواوی دەگۆڕنەوە بە رێنمایی و پەیرەوکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە و

پێغەمبەرکەی (صلی الله علیه وسلم)، کە نە بازرگانیەکانیان سوود بەخشە و نە لەو کەسانەن کە ڕێی ڕاستیان گرتۆتەبەر. خوشکی بەڕێزم: چۆن بە هیچ جۆرێك نامەوێ کە خۆم بەر سزای خوای گەورە بکەوم، هەمان شتیش بۆ تۆ دەخوازم. چونکە ئیسلام وای فێرکردووین، بۆیە، تا دەرگای تەوبە و گەڕانەوەت لێ دانەخراوە، پەلەبکە بەرەو باوەشی پڕ لە سۆزی ئیسلام و، دەست بە پەیامەکەیەوە بگرە و خۆتی پێ بەختەوەر و سەرفراز بکە. چونکە ئیسلام تاکە وێستگەیە بۆ وەدەست هێنانی ژیانێکی پڕ لە ئاسوودەیی و ئارامی لەم دونیایەدا و، وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای میهرەبان لە ڕۆژی قیامەتدا.

و اخر دعوانا ان الحمدلله رب العالمين

و صلى الله على رسول الله محمد وعلى اله وصحبه أجمعين

# ناوەرۆك

خوشکی بەڕێز...
دوای ئەوەی ئەم نامیلکەیەت خوێندەوە، هەموو ئەو پاساوە دروستکراوانەت بەشیکردنەوە بەرچاو کەوت، دەبێ ئێستا بڕیارت چۆن بێت؟.
ئایا گەیشتیتە قەناعەت؟
کەواتە هەر لەئێستاوە هەنگاوی یەکەمت بەرەو جیهانی پاکی بنێ و تاجی نووری بخەرە سەر.
هەر ئەم تاجە لە داروخان و لەنێوچوون دەتپارێزێت، ئەگینا دەبیت بە نمایشگای چاوی کەسانی گەندەڵ.

